## گەرمی و تینی بەهێزی مالی جحیم :

بێ گومان گەرمی تینی گڵپەی ئاگری دۆزەخ بەراورد ناكرێ بە گەرمی ئاگری دونیا ، هەر وەك لە فەرموودە یەی پێیەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دا هاتووە دەفەرموویت : (( لو كان المسجد مائة ألف او يزيدون وفيهم رجل من أهل النار فتنفس فاصبهم نفسه لاحترق المسجد ومن فيه )). ( تهذيب الترغيب والترهيب )

واتە : ئەگەر لە مزگەوتدا هەزار یان زیاتر لە هەزار كەسی تیدا بێت و یەكێكی لە ئەهلی دۆزەخ تیا بێت ، هەناسە بدات و هەناسە كەی پیان بكەوێت ، ئەوا هەناسەكەی مزگەوت و ئەوشی تیدایەتی دەی سووتێنێت ..!!

لە كتابی ( زهد ) ی پێشەوا ئیمامی احمد دا هاتووە ، دەڵێت جاریكیان ئیمامی ( عمری كوری ختاب ) – خوا لی رازی بێت – دوای ئامۆژگاری لە ( كەعب ) كرد و فەرمووی :

( يا كعب خوفنا ، قلت يا أمير المؤمنين وا ليس فيكم كتاب الله وحكمة رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) ؟ قال : بلى ولكن خوفنا ،فقلت يا أمير المؤمنين أعمل رجل لو وافيت يوم القيامة بعمل سبعين نبيا لا زريت عملك مما ترى ، فاطرق عمر – ونكس – مليا افاق فقال : زدنا يا كعب . قلت : يا أمير المؤمنين لوفتح من جهنم قدر منخر ثورة بالمشرق و رجل بالمغرب لغى دماغه حتى يسيل من حرها ، فاطرق عمر – ونكس – مليا ثم افاق ، فقال : زدنا يا كعب . قلت : يا أمير المؤمنين أن جهنم لتزفر يوم القيامة زفرة لا يبقى ملك مقرب او نبي مصطفى الاخر جاثيا على ركبتيه ويقول رب نفسي ال اسئلك اليوم الا نفسي ، فاطرق عمر ماليا . فقلت : يا امير المؤمنين ، او ليس تجدون هذا في كتاب الله عز وجل ؟ قال : كيف ؟ قلت : قول الله تبارك وتعالى : ﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَنْ نَفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ النحل ١١١ .

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ نَارٌ حَامِيَةٌ﴾ القارعە ١٠.واتا : ئاگرێكی زۆر سووتێنەرو بلێسە دارە هەرگیز خامۆش نابێت و تین و هێزی كەم ناكات .

هەروەها ( خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ﴾ المرسلات ٣٢ . واتا: بەراستی ئەو ئاگرە بلێسە یەك فڕێ دەدات وەك كۆشك تەلاریكی گەورە مەزنە ..!!

واته : ئەی (کەعب ) بمان ترسینە ..!! منیش ووتم : ئەی ئەمیری موسلمانان ئایا لە نیو ئیوەدا کتیبەکەی خواو سوونەتەکانی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) نیە..؟! ئەویش فەرمووی : بەلی هەیە بەلام بمان ترسینە ، پاشان ووتم ئەی ئەمیری موسلمانان تۆ ئەوەندەکاری گەورەو زۆر بکە ئەگەر لەرۆژی قیامەت دا بهینریت هەتا ئەندازەی حەفتا پیغەمبەر کاری چاکەت کردبیت ، هیشتا کارەکەت بە کەم دەزانیت ..!! لە چاو ئەو ئەو ناخۆشیانەی کەلە قیامەتدا دەیان بینی ..!! ئەمیری موسلمانان سەری دا نواندو بۆ ماوەیەك سەری سورما مات بوو ..!! پاشان بە ئاگا هاتەوە پاشان فەرمووی : زیاتر بمان ترسینە ئەی کەعب ..!! ئەلی منیش ووتم : ئەی ئەمیری موسلمانان گەر ئەندازەی لووتی گایەك لە رۆژ هەلاتەوە دۆزەخ بکریتەوە وە پیاویکیش لە رۆژئاوا بیت ، ئەوا ئەو پیاوە میشکی دەکولیت وهەتا لە گەرمی دا دەتویتەوە و دەروات . ئەمیری مسلمانان بۆ ماوەی ساتیك دانواندو مات و بی ئاگا بوو ، پاشان هاتەوە هۆش خۆی ئینجا فەرمووی : ئەی کەعب زیاتر بمان ترسینە . ئەلی منیش ووتم :ئەی ئەمیری موسلمانان بەراستی لە قیامەتدا ، دۆزەخ دەنگ هاوار نالەیەکی زۆر گەورەو وەها لی دیت ، گەر هەرچی فریشتەی نزیك یان پیغەمبەری هەلبژیردراوە هەیە لەسەر ئەژنۆ دەکەون و دەلین : ئەی پەروەردگار تەنها نەفسی خۆم دوا دەکەم تەنها نەفسی خۆم وەداوی کەسی ترت لی ناکەم تەنها نەفسی خۆم رزگار بکە ، ئەمیری موسلمانان سەری دانواندو کەمیك بی ئاگا بوو ، ئینجا من ووتم : ئەی ئەمیری موسلمانان ئایا ئەم رووداوە لە کتیبەکەی (خوای گەورە ) بەدی ناکەی فەرمووی چۆن ..؟! منیش ووتم : ئەم ووتەی کە (خوای گەورە ) و تبارك وتعالى دەفەرموویت : ﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَنْ نَفْسِهَا وَتُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ النحل ١١١ واتا : رۆژیك دیت کە هەموو کەس خەمی نفسی خۆیەتی ، بەرگری لە نەسی خۆی دەکات پاکانە بۆ نەفسی خۆی دەکات ، گویی بە کەسی تر نادات ،ئە و خەلکە ستەمیان لی ناکریت ..!!

واتە: ئەورۆژە هەر کەسیك یان هەر نەفسیك چاکەی کردبیت یان خراپەی کردبیت بە پی چاکە کەی پاداشتی دەدریتەوە ،وە ئەوی خراپە شی کردبیت بە پیی خراپەکەی سزا دەدریت لە مالی جحیم دا دەمینیتەوە ، هیچ کەسیك ناحەق بەرانبەر ناکریت پاداشت سزا بە پیی کردەوە کانی خۆی وەردەگریت..!!

## دەرگاكانی مالی جحیم :

دەرگاكانی مالی جحیم یان دۆزەخ  حەوت دەرگای هەیە كەلە قورئان و فەرموودەی پیغەمبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) دا هاتووە .

( خوای گەورە ) دەفەروویت : ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ (٤٣) لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِكُلِّ بَابٍ مِنْهُمْ جُزْءٌ مَقْسُومٌ﴾الحجر ٤٣-٤٤ . واتا : بی گومان دۆزەخیش موعد بەلینگای هەر هەموو ئەوانە بەگشتی .. !! دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە یان حەوت دەروازەی هەیە ، هەر دەروازەیەكیش چەند دەرگاو چەند بەشیكە كەدەستەی دۆزەخیان ، بەگویرەی تاوان و گوناهیان را پیچ دەكرین بۆ ناوی .. !!

هەروها ( خوای گەورە ) دەفەروویت : ﴿فَادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَلَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ﴾ النحل ٢٩ . واتا : كەواتە لە دەروازەكانی  دۆزەخەوە بچنە ژوورەوە و بۆ هەمیشەیی ونەبراوەش تیادا بن ،ئای كەجیگەو ریگەی خۆ بەزل زانەكان ناخۆش و نا لەبارو ناسۆرە .. !!

هەروەك لەم فەرموودەیەدا  پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەروویت : (( اذا جاء رمضان فتحت ابواب الجنة ، وغلقت ابواب النار )).واتە : ئەگەر  رەمەزان بیت دەرگاكانی بەهەشت دەكرینەوە و دەرگاكانی دۆزەخ دادەخرین ..!!

بەلی مالی جحیم حەوت دەرگایی هەیە بۆ ئەو كەسانەی شوین كەوتووی شەیتانەكان دوو روو مونافیقە كان و خۆ بە گەورە زان ، هەر دەرگایەك لەوەی تر نزم ترە ..!!

هەروەها ( ابن جریج ) دەلیت : حەوت دەرگای هەیە یەكەمیان :الجهنم ) دووەمیان ( لظی ) سی یەمیان ( الحطمة ) چوارەمیان ( السعیر) پینچەمیان ( سقر ) شەشەمیان ( الجحیم ) حەوتەمیان ( الهاویە ) .بەلام ئەمانە ناوە كانی دۆزەخن نەك دەرگاكانی دۆزەخ بی گومان دۆزەخ جەند ناویكی هەیە بەگشتی ئەمانەی سەرەوەن ،ئەمەش رای بۆچوونی ( ابن جریج ) .

## ناوەکانی مالی جحیم :

**١-النار :** ئەم ناوە لە زۆر سورەتەکانی قورئانی پیرۆز دا هاتووە هەروەکو ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾الاعراف ٣٦ .واتا: ئەوانەی کە باوەڕیان بە ئایەت و فەرمانەکانی ئیمە نەبووە ، لووت بەرز بوون بەرامبەریان ئا ئەوانە نیشتەجی ناو ئاگری دۆزەخن و بە هەمیشەیی تیایدان ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿الَّذِي يَصْلَى النَّارَ الْكُبْرَى﴾الاعلى ١٢ .

واتا: ئەوەی دەچیت ناو ئاگرە گەورە کەوە و دەسوتیت تیایدا .

**٢-جهنم :** بی گومان ناوی جهنم زۆر لە قورئاندا هاتووە کە( خوای گەورە ) دەفەرموویت :

﴿الَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَى وُجُوهِهِمْ إِلَى جَهَنَّمَ أُولَئِكَ شَرٌّ مَكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا﴾ الفرقان ٣٤

واتا: ئەوتاوانبارنەی دژایەتی بەرنامەی خوا دەکەن لەسەر ڕووخساریان را دەکیش رین بۆ دۆزەخ و تیایدا کۆدەکرینەوە ، ئا ئەوانە ناخۆشترین جیگەیان هەیە ، چونکە گومراترین ڕیبازیان کاتی خۆش گرتبووە بەر.

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنْسَانُ وَأَنَّى لَهُ الذِّكْرَى (٢٣) يَقُولُ يَا لَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي (٢٤) فَيَوْمَئِذٍ لَا يُعَذِّبُ عَذَابَهُ أَحَدٌ (٢٥) وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُ أَحَدٌ﴾الفجر ٢٣-٢٥ .

واتا :ئە ڕۆژە دۆزەخ دە هینریت و نیشان دەدریت ، جا ئەو ڕۆژە ، ئەو مرۆڤەی کە بی باوەر بووە دەزانیت چ پەندیکی بەسەر خۆی هیناوە بەلام تازە پەشیمانی سوودی بۆی نیە هیچ سوودیکی پی ناگەیەنی و دادی نادات ..!!ئەوسا بەسەر شۆڕیەوە و بەکەساسی و هەناسەی ساردەوە دەلیت :خۆزگە بۆ ئەم ژیانە دەست پیشخەریم بکردایە ..!! جا ئیتر ئەوڕۆژە کەس وەك خوا بەخشم و قین نیە لەبی باوەران ، لبەر ئەوە سزایەکیان دەدات کە کەس ناتوانیت سزای لە چەشنە بدات ..!!

**٣-الجحيم :** ئەو ئاگرەی کە زۆر بلیسە دارو گەورەیە ناوەوەی زۆر قوول و دژوارە ، شوینی خەڵکی زۆر دەبیتەوە ،بیگومان ئەم ناوەش واتە : ( جحیم ) زۆر هاتووە لە قورئانی پیرۆز دا .

( خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ﴾ التکویر ١٢ . واتا: کاتیك دۆزەخ دادە گیرسیت وتاو دەدریت ،کەوتە گلپە گلپ ..!!

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿لَتَرَوُنَّ الْجَحِيمَ﴾ التکاثر ٦ . واتا: سویند بە خوا بی گومان دۆزەخ دەبینن ( دۆزەخیکی تۆقینەرو پر لە ئازارو ناسۆرە ..!!

**٤-السعیر :** ئەم ناوەی دۆزەخ ( ١٦ ) جار لە قورئانی پیرۆز دا هاتووە ، مانەکەشی واتە : توندی ئاگرە کەو گلپە دەکات ، پەیتا پەیتا جۆش دەدریت ،ئەمەش بۆ شەیتانەکان و بی باوەران و ستەم کاران موناڤیقە کان و خۆبەزل زان و خواردینی مالی خەلك بە ناحەق وە خواردنی مالی یتیم بە ناحەق .

( خوای گەورە ) دەفەرموویت ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ فاطر ٦ . واتا: چونکە بەراستی شەیتان دوژمنتانە ئیوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنین ، بی گومان بانگی تاقم و دارو دەستەی خۆی دەکات بۆ ئەوەی ببنە نیشتەجیی دۆزەخ ..!!

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِتُنْذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنْذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ﴾ الشوری ٧.

واتا: ئا بەو شیوەی کە دەیزانیت قورئانیکی عەرەبی پاراومان بە وەحی و نیگا بۆ ناردیت بۆ ئەوەی شاری مککە و دەوروبەری کە هەموو زەوی دەگریتەوە ئاگادار بکەیت ، بەتاییەت ئاگاداروو هۆشیاریان بکەین لەرۆژی کۆ کردنەوە کە هیچ گومانی تیدا نیە ، ئەو رۆژە خەلکی دەبنە دوو بەشەوە ، دەست یەکیان بۆ بەهەشت بەری دەکرین و دەچنە نا بەهەشتەوە ، دەستەکەی تریان بۆ ناو دۆزەخ را پیچ دەکریت ..!!

**٥-الحطمة :** واتە : تیکشکینەر ئەو کەسەی بکەویتەناوی تیکدەشکینریت دەسووتینریت ، ئەم ناوەی دۆزەخ لە سورەتی (الهمزە ) هاتووە لە ئایەتی (٥) دا ، بۆ ئەو کەسانەی کە عیب وعار لە خەلك دەر دینین ، هەموو ئەوانەی ناو ناتۆرە لە خەلك دە نین ، یان بۆ ئەو کەسانەی کە پارە کۆدەکەنەوە وادەزانن هەتاهەتایی لایانە ، یان بیر لەمردن ناکەنەوە هە خەریکی پارە کۆکردنەوەن ..!!

(خوای گەورە) دەفەرموویت : ﴿وَيْلٌ لِكُلِّ هُمَزَةٍ لُمَزَةٍ (١) الَّذِي جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُ (٢) يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ (٣) كَلَّا لَيُنْبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ (٤) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ (٥) نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ (٦) الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِدَةِ (٧) إِنَّهَا عَلَيْهِمْ مُؤْصَدَةٌ (٨) فِي عَمَدٍ مُمَدَّدَةٍ (٩)﴾الهمزە . واتا: هاوارو ئاهو نالە بۆ هەر کەسیك کە بەشوین کەم و کوریدا دەگەرین و لەعەیب و وعاری خەلك دەدویت ..!!ئەو کەسەی مال و سامانی زۆری کۆ کردۆتەوەو هەر خەریکی ژماردنیتی و (دلی پی خۆشە ،رەزیلە بە خشندە نیە ..!! وادەزانیت بەراستی کە مال و سامانەکەی دەبیتە هۆی تەمەن دریژی و نەمریی بۆی ..!! نەخیر سویند بەخوا بە سووکی و ریسوایی فری دەدریتە ناو (الحطمة) وە ..!!جا تۆ دەزانیت (الحطمة) چیە ..؟! بریتی یە لە ئاگری داگیرساوو بلیسە داری خوا ..!!

ئەو ئاگرەی روو دەکاتە ناو جەرگەی دل و دەروونەکان کە مەلبەندی کوفرو خوانەناسی و رەزیلی یە ..!!

بی گومان ئەو ئاگرەی دۆزەخ لەشوینیکدایە کە سەر گیراوە دەرگای داخراوە دەرگاکە لە ئاسنیکی زۆر بەهیز دروست کراوە ، هیچ ریگەیەکی دەرباز بوونی بۆ نیە ..!!خوانەناسان لەویدا لە نا چەند ستوونیکی ئاگرینی دریژدان هیچ جم و جولیکیان بۆ ناکریت ..؟!

بەلی ئەو کەسەی هەر پارە کۆدەکاتەوە وادەزانیت نامری ؟! مال سامانی خەلك بۆ نەوە مندالە کانی کۆدەکاتەوە خەلکیش لە برسان دەمریت ..؟! وادەزانی ئەم حەقەی خەلکی لی ناسینریتەوە..؟! ئەم چاوەی جاسووسی لەسەرخەلك کردووە ،بوختانی بەخەلك دا کردووە ،یان ئەو گویی گوییستی قسەی خەلك بووە کە نەدەبوو بی کات خەلکی پی سزا بدات ..!! یان ئەو دەستەی بۆ حەرام دریژ کردووە هیچ گویی بە حەرام حەلال نەدەدا ، یان خەلکی لەزیدان کردووە بە ناحەق ئازاری جستەیی دەروونی خەلکی داوە ..؟! بەلی بەدلنیاییەوە (الحطمة) ئامادەیە بۆی چاوەری تی کە بە ناخۆشترین شیوە پیشوازی لی بکات کە هەرگیز ئیش ئازاری وا نەبینی بیت لە ژاینی دونیا ،ئەی ستەم کار تۆبە بکە بگەرینەوە بۆ لای پەیامەکەی خوا ئیتر بەسە واز لە ستەم کردن بهینین خۆ ئەوتا بەلگەی روون ئاشکرا لەبەردەست دایە ..!!

**٦-لظي :** واتە: پرشكی ئاگر كە پيستی سەريان دەبرژێنێت پاشان هەردوو دەستی هەردوو لاقی ،ئەم ئاگرەی دۆزەخ بۆ ئەو كەسانەيە كە دژايەتی ئاينی پيرۆزی ئيسلاميان كردووە لەرێگای دەسەلات پارە و داور دەستەكەيان ، كەخەلكيان بە ناحەق ئازارو ئەشكەنجەيان داوە يان جاسووسيان لەسەر خەلك كردووە ناووناتۆرەيان بۆ هەلبەستيوە ،يان ئەو كەسانەی كە شوينی بانگەوازی ئيسلام نەكەوتوون شوينی هەواو ئارەزووی خۆيان و شوينی وەلاتانی خاچ پەرستان كەوتوون ، ئەم شوينە جيگەيانە دە بخۆن ..؟!

( خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿كَلَّا إِنَّهَا لَظَى نَزَّاعَةً لِلشَّوَى﴾المعارج ١٥-١٦

واتا: نەخير .. ئەو ئاواتانە هيچی نايەتە دی .. بەراستی دۆزەخ ئامادەيە بليسەدارەو داخ لە دلە ..!!

لە كاتيكدا ( لَظَى ) داماليني پيستی سەرو هەموو ئەندامەكانە ،يان برژينەری پيستی سەرو ئەندامەكانيەتی ..؟!

( خوای گەورە ) دەفەرموويت ﴿فَأَنْذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّى (١٤) لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى (١٥) الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّى﴾الليل ١٤-١٦.

واتا: جا من ئەوەتە ئاگادارتان دەكەم و دەتانترسينم لە ئاگريك كە زۆر بليسە دەسينيت ..!!ناچيتە ناوی مەگەر كەسانی ناپوخت و درندە و خوانە ناس نەبيت ..!! وە ئەوەی حقيقەت و راستی بە دۆر داناوە و پشتی هلكردووە لە بەنامەی خوا ..!!

بەلی ئەم شوينەی ( لَظَى ) بۆ ئەو كەسانەيە كە وەك درنەدە رفتار لە گەل خەلكی بی تاوان دەكەن ،هيچ بەزەيەكيان بەم خەلكە موسلمانە دا نايەتەوە دژايەتی حەق و راستی دەكەن ، تەنها گويی بۆ درۆ كردن دە گرن لە راستی دوور دەكەونەوە ، خەلكيش گومرا دەكەن لەراستی حقيقەتی ئەم پەيمايە خوای گەورە ، بەلی پشتيان هەلكردووە لە بەرنامە ريبازی قورئانی پيرۆز فەرموودەكانی پيغەمبەری نازدارمان ( صلی الله عليه وسلم ) بە هەموو جۆريك دژايەتی ئاينی پيرۆزی ئيسلام دەكەن لە ريگايی بە ناو ريخراوەكانی مرۆيی يان ئازادی تاك يان ئازادی مرۆڤ ، خەلكی چەواشە دەكەن بە درۆيی بريقەدارو نا راست ، دوور لە حقيقەتی بەرنامەی خوا ،بەلی بی گومان سەرئە نجاميان مالی جحيم بۆ ئەوانەدەبيت بۆهەتاهەتايی ..!!

**٧-الهاوية :** قولایی دۆزەخ ، ئەم ناوەی دۆزەخ ، ووتراوە پلەی هەر خوارەوەی دۆزەخە ، واتە : پلەی دووروو مونافیقەکان و ستەمکارە کانە ، وەك فیرعەونەکانی سەردەمی رابردوو ،مونافیقە کانی سەردەمی پیغەمبەری رۆشنایی چاومان ( صلى الله عليه وسلم ) وەك ( عبدالله ی کوری ئوبەی کوری سەلول ) یان مونافیقە کانی ئەم سەردەم کە دەست هەلاتیان لەدەست دایە یان ستەم کارانی ئەم سەردەمە ، کە ماف و حەقی خەلکی پیشەل دەکەن بە نارەواو ، بەدرۆ کردن و دووروویی و نیفاق کردن لە گەل خەلکی دەلین ئێیمەچاکسازی دەکەین کەچی دۆر دەکن دوروون کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ (١١) أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِنْ لَا يَشْعُرُونَ﴾البقره ١١-١٢ .واتا:ئەوانەکاتیك پیان دەووتریت خراپەکاری مەکەن لەسەر زەوی ،ئەوان دەلین : بەراستی ئیمە تەنها چاکسازی دەکەین ..؟! ئاگادار بن کەراستی هەر ئەوان خراپە کاری دەکەن ،بەلام بەهۆی لووت بەرزی و دەر دەدارییانەوە هەستی پی ناکەن و خۆیان لی گیل دەکەن ..؟!

بەلی الهاویە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ، کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ (٩) وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ (١٠) نَارٌ حَامِيَةٌ﴾ القارعه ٩-١١ . واتا : ئەوە دایکی ئەو دۆزەخ باوەشی بۆ کردۆتەوە ..!! جا تۆ چووزانی ( هاویە ) چیە ؟! ئاگریکی زۆر سوتینەرو بلیسە دارە خاموش نابیت تینی کەم ناکات و لە کۆلی نابیتەوە ..!!

هەروەها بوخاری و مسلم لە ( ابو هوريره ) وە بۆمان دەگیریتەوە دەلیت : پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : (( ناركم هذه يوقد ابن آدم جزء من يبعين جزءا من حر جهنم )) . واتە : ئەم ئاگرەی دونیا بەشیکە لە حەفتا بەشی ئاگری قیامەت ، هاوەلان ووتیان : سویند بەخوا ئەوەندە بەسە ! مەبەستیان ئاگری دونیا بووە ، پیغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( إنها فضلت عليه بتسعة وستين جزء كلهن مثل حرها )). واتە : بەراستی ئەو ئاگرەی دۆزەخ ( ٦٩ ) جار لەم ئاگرەی دونیا دا گەرم ترە یان گەورە ترە هەر بەشیکی ئاگرە کە وەك گەرمی دونیا دە بیت ..!!

زانایان لەسەر ئەم حەوت ناوە کۆکن یەك دەنگن ،بەلام هەندیك ناوی تریش هاتووە لە قورئانی پرۆزدا .

## ئەم ناوانەی تری مالی جحیم ئەمانەن :

**١-النار الكبرى :** واتە : ئاگرەیکی زۆر گەورە و مەزن،بۆ ئەوکەسانەیە کەگوی بەفەرمانەکانی خوا نادەن ئینکاری دەکەن لەم پەیامەی خوای گەورە دا ،بە دوا هەواو ئارەزووی خۆیان کەو توون تکبر و خۆ بەزل زانن ، بەرانبەر بە خەلکی فەقیر هەژار دا ، بەلی ئەم شوینە جیگایانەبۆ هەتاهەتایی ..!!

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿الَّذِي يَصْلَى النَّارَ الْكُبْرَى (١٢) ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَا﴾الاعلى ١٢-١٣ .واتە : ئەوەی دەچیت ناو ئەو ئاگرە گەورەیە و دەسووتینریت تیایدا ..!!ئا لەم دۆزەخە گەورەیەدا نەئەوەیە تیدا دەمرن و رزگاریان دەبیت ، نەئەوەشە کە ژیانیکی ئاسایی بەسەر بەریت ..!! بی گومان لەژیانی دونیادا ئازارو ئەشکە نجە بدریت دواتر لە ئازارو ئەشکە نجەیە دا دە مریت و رزگارت دەبیت لە ئازار دان دوای مردنە کەت ، بەلام ئە گەر ئازراو ئەشکە نجە بدریت و نەش مریت ،ئای جەندە ناخۆشە ئەم ئیش ئازارە لە دەستی رانەکەیت ناش مریت ..!!ئەی ئەگەر بیریك لە بەهەشتەکەی خوا بکەینەوە کە چەندە خۆشەو تیدا ژیانیکی زۆر زۆر خۆش بەسەر دەبەیت کە وەصفی ناکریت لە دونیادا لەخۆشی ئەم بەهەشت دا ، کە چی لەویشدا مردن ینە ،چونکە مردن لەرۆژی قیامەتدا سەردەبریت نامینی بۆ هەتا هەتایی ، بە نەمری دەژین جا ئەوەی ئەهلی بە هەشت بیت یان ئەوەی ئەهلی دۆزەخ بیت ...؟!!

**٢-سقر :** واتە : بیریکی قولی ئاگرینە ، وەك بروكان وایە گلپە دە كات و دەكۆلیت قەلدە قولیت ..!!

بی گومان ئەم شوینە بۆ ئەو کەسانەیە کە نویژ ناکەن بەدوای بەرنامەی خوا و پیغەمبەرەکەی ناکەون ،بەلی شوینی مجریمە کان و ستەم کارە کانە ئەوانەی جەردەی دەکەن ریگری لەبلاوبوونەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەکەن ، یان ئەوانەی تاوانکاری بەرانبەربە خەلك دەکن جا دزی کردن بیت یان ئازارو و ئەشکنجەدان بیت یان بە ناحەق مالی خەلکی دە خۆن گویی بە حەلال وحەرام نادەن ،هەر لووشی دەکن و وەك ئاژەل رفتاردەکەن لە گە خەلکی بی تاواندا یان ئەو کەسانەی لە نویژە نەکەران بوون یان ئەوکەسانەی زکات مالی خوا یان نەدەدا رەزیل قرچووك بوون یان ئەوکەسانەی عیبەیان نەدەزانی بی شەرم وبی ئابروو بوون دەم دریژیان دەکرد بە بەرنامەکەی خوا یان باوەریان بەرۆژی حیساب نەبوو ..!!

( **خوای گەورە** ) **دەفەرموویت :** ﴿إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ (٤٧) يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ﴾القمر ٤٧-٤٨ . واتا :بەراستی تاوانبارو تاوانکاران لە گومرایی و شیتیەکی زۆردا رۆچوون ..!!رۆژیك دیت کەلەسەر روویان رادەکیشرین لە ناو ئاگری دۆزەخدا ، پییان دەوتریت : دە بچیژن تالاوی دۆزەخ ..!؟

( **خوای گەورە** ) **دەفەرموویت :** ﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ (٢٦) وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ (٢٧) لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ (٢٨) لَوَّاحَةٌ لِلْبَشَرِ (٢٩) عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ﴾المدثر ٢٦-٣٠ .واتا: ئەو بی زەمیرە یان بی ویژدانە بەسەریەوە ناچیت !؟ دەبیت بیگەینمە ناو سقر ، جا تۆ چووزا نیت سقر چیە !؟ هیچ ئەندامیکی جستە یان لاشە ناهیلیتەوە دەست هەناگریت ..!!پیستیان هەلدەقرچینیت و رەشی دەکات و دەری دەخات ..!؟ ١٩ فریشتە یان ملائکە سەرپەرشتی سقر دەکەن یان دۆزەخ دە کەن ..!!

**هەروەها** ( **خوای گەورە** ) **دەفەرموویت :** ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ (٤٢) قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ (٤٣) وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ (٤٤) وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ (٤٥) وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ﴾ لمدثر ٤٢-٤٦. واتا :ئەوە چی بوو ئیوەی راپیچی سقر کرد ..!؟ بە کەساسیەوە دەلین : ئیمە لە نویژ کەران نەبووین ..!؟خۆراکمان بە هەژاران نەدەبەخشی ..!؟ ئیمە لە گەل دەم دریژو بی ئابووەکاندا قەسەی خۆمان دەکردو لە بابەتی ئەوا نمان دەگوت و رەخنەی بی جیمان دەگرت لە گەلیان رۆدەچووین ..!؟ ئیمە بورامان بەرۆژی پاداشت و سزا نەبوو ..!؟

**٤-ویل :** دۆڵیکی ئاگرینە بۆ ئەو کەسانەی درۆزن و دووروون بەبەردەوامی درۆدەکەن لە ناو خەڵکی دا هەر قەسەیەك بکەن دە بیت درۆی تیدابکەن و وعد ی خۆیان بەجی ناهینن یان ئەو کەسانەی باوەریان بەوە نیە کە رۆژی موعد یان قیامەت و حیساب دیت یان ویل بۆ ئەوانەی کە لە کیشان و پیوانە خەش و فرتووفیل دەکەن یان لە هەلسەنگاندنی خەلکی دا راست نالین و درۆ دەکەن یان ئەو کەسانەی بەشوین کەم کوری خەلکیدا دە گەرین و عیب و عاری خەلکی ئاشکرا دەکەن ، یان ویل بۆ نویژ نەکەرانە ،یان ویل بۆ ستەم کارانی ئەم سەردەمە و سەردەمانی رابوو ،یان ویل بۆ ئەوانەی کە دل یان رەق بەرانبەر ئاینی ئیسلام و بەرنامەکە یان ویل بۆ مشریك کافارن و بی باوەرەکانی ئیستا ..؟!

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ﴾ المرسلات ١٥ .واتا: هاوارو ئاهو نالە لەو رۆژەدا بۆ ئەوانەی کە براوایان بە پیغەمبەران وقیامەت و لیپرسینەوە نەبوو ..؟!

( خوای گەورە ) دەفەرموویت ﴿وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ﴾المطففين ١ .واتا: هاوارو نالە بۆ ئەو کەسانەیە تەرازووبازی دەکەن لە کیشان وپیوانەدا لە کرین و فورشتندا فیل دەکەن یان هەلسە نگاندنی خەلکیدا راست نالین ..؟!

( خوای گەورە )دەفەرموویت : ﴿وَيْلٌ لِكُلِّ هُمَزَةٍ لُمَزَةٍ﴾ الهمزە ١ . واتا: هاوارو نالە بۆ هەر کەسیك کە بەشوین کەم کورییدا دەگەرین و لەعەیب و وعاری خەلکی دەدویت ..؟!

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ﴾ الماعون ٤. واتا : جا هاوار واوەیلا بۆ نویژ نەکەران..؟!

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ﴾الزخرف ٦٥. واتا : ویل و قورەبەسەری بۆ ئەوانەی کە ستەمیان کردووە ستەم دەکەن ،لەسزاو ئازای رۆژیکی پر ئیش ..؟!

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَوَيْلٌ لِلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ أُولَئِكَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾الزمر ٢٢ . هاواور واویل ئەووانەی کە دلیان رەقە بەرانبەر قورئان و بەرنامەی ( الله ) یان زکری ( الله ) .

**٥-دار بوار :** واتە شوێنی ئەو کەسانەیە کە کفریان کردووە بە نازو نیعمەتەکانی خوای گەوە ،واتە نیعمەتەکانی خوا حرام دەکەن و تکبرو لووت بەرزی دەکەن کە بە نازونیعمەتی کە خوای گەوە پی بەخشینە ، لە سەر ئەم هەموو نازو نیعمەتەی خوا دەستی کردووە بە خراپە کاروی تاوان و تاوانکاری ، کەلە م سەردمەدا بۆ تە دیاردە لە نیو کۆمەلگای ئیسلامی دا ، هەموو نازوو نیعەتەکانی خوای گەورە ، لە بەردەستی دایە کەچی دەست بۆ شتی پروپوچو حرام و قیزەون دەبات لە جیاتی شیت پیەسوود حەلال دەست بۆ حەرامەکە دریژ دەکات ،کۆکردنەوەی مال وسامان بە حەلالی دەستی دە کەویت کەچی ئەو پەنا بۆ حەرامەکەدەبات یان ئافەرتی حەلال لە بەردەستی دایە خەریکی داوین پیسەیە بە حەارم کردن ، یان ئەوتا نیعمەتەکانی خوا کە بۆ رەوانەکردووە قەدری ناگریت و شتی حەرام و پیپیش دلی پی خۆش دەکات ، ئەوکەسانەی کە دەسەلات و فەرمان رەوایەتی دەکەن ئەمەش نازونیعەتە کە خوا بۆ رەوانەکردووە یان ئەم هەموو کۆشك و بیناو تەلارە و پارەو سامانە زۆرە یان هەیە کەچی ستەم لە خلك دەکەن قەدری ئەم نازو نیعمەتە ناگرن کە خوا پیداون ، بەلی شوینی ئەوانە مالی بوارە کە شوینیکی دۆزەخ خوای گەورە بۆ ئامادە کردوون ،بۆ ئەو چاو جنۆکانەی ئەم سەردمە و سەردەمی رابردوو ، وەك فیرعەون قارون هامان و ابو جهل و ئەوانەی ئیستا کە دەسەلاتی وەلاتانیان بەدەستەوەیە خەلك لە ژیر دەستیان دا زیرە دەکەن لەبەر پرسیەتی و نا حەقی نا عەدالە تی کردنیان ،بەلی ئەم جۆرە کەسانە ش بۆنەتە هۆی تیاچوونی خۆیان و تیا چوونی قەو مەکەی خۆیان ،کە لەئیستا دا تووشی توورەیی خوای گەورە بوونە بەهۆی ئەو هەموو خراپە کاریە ی کە ئە نجامی دەدەن ،فنتە و ئاژاوە نانەوە لە نیوان خەلکی دا ئە نجامی دەدن ، بەلی ئەوان شوینی دار بوار سەرئە نجامیانە بۆ هەمیشەیی بۆ هەتاهەتایی ..؟!

( خوای گەورە ) **دەفەرموویت :** ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَةَ اللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ﴾ابراهیم ٢٨ واتە : ئایا سەرنجی ئەوانە نادەیت کە نازو نیعمەتەکانی خوایان بە حەرام گیراوە ،بۆ گوناهو خراپە بەکاری دەهینن ، و بوونەتە هۆی سەرگەردانی و تیاچوونی قەومەکەی خۆیان ..؟!

## شوێنی مالی جحیم :

بێ گومان شوێنی مالی جحیم یان دۆزەخ یان جهنم ، هیچ كەسیك نایزانی لە كویە بەلام ئەوەندەی هەیە زانایانی ئاینی ئیسلامی پیرۆز ،ئەوە یان روون كردۆتەوە كە دۆزەخ لە ئاسمانەكان دا نیە بەلكو لە زەوی دایە ، بەلام جیاوازی هەیە لە نیوان زانایانی ئاینی ئیسلام هەندیكیان دە لین : مالی جحیم لە بنی یان لە ژیر دەریاكاندایە هەندیكی تریان ئەلین : لە ناو زگی یان لە ناخی زەوی دایە ، هەرچەندە بەلگەی روون و ئاشكرا نیە لەسەر ئەم راو بۆ چوونانە ،بەلكو تەنها ( خوای گەورە ) زانایە پی هەر خۆی دەزانیت ، لە گەل ئەم هەموو راو بۆچوونەشدا ، دەبیت باوەر مان بەوە هەبیت كە مالی دۆزەخ لە زەوی دایە ، بەلام نازاندریت لە چ شوینیكی زەویدایە ، لە ئاسمانەكان دا نیە ..!!

هەروەها بەلگەی ئایەتی قورئانی پیرۆز هەیە كە ئاماژە بە وە دەكات ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الْفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٍ﴾المطففين ٧. ( سجین ) بەمانی زەوی دیت ، هەروەها لە فەرموودە یەكی پیەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) كە دەفەرمووی : بی باوەران یان كافران ، دەر گاك انی ئاسمان ناكەونەوە ، كەواتە دە بیت دۆزەخ لە ژیر زەوی دا بیت .خوای گەورە زاناترە .

## ژمارەی سەرپەرشتیاری خزینەی وە ناوی سەرۆکی خزینەی مالی جحیم :

**فریشته كانی (خوای گەورە ) راوەستاون لە سەر خزانەی ئاگری دۆزەخ چاوەریی ئەو كە سانە دەكەن كە دەخرینە ناو مالی جحیم یان دۆزەخ ، بەلی فریشتەكان سەرپەرشتیاری دۆزەخیە كان بە ویكل ، هەروەها فریشتەی مالی ححیم (خوای گەورە ) وە های بەدیهیناون و دروستی كردوون ، كە زۆر بە هیزو زۆر بەقوەت و گەورەو زەبەلاحن ئەوەندە بەهیزن قدرەت و هیزیان تەنها (خوای گەورە ) زانایە پی ، هەروەها ئەم فریشتانەی خزانەی ئاگری دۆزەخ زۆر دل رەق توره و توندو تیژن لە گەل ئەو كەسانەی كە ئەهلی مالی جحیم و دۆزەخن ، هەروەها ئەم فریشتانە نافەرمانی خوا ناكەن لە هیچ شتیكدا كە خوای گەورە فەرمانیان پی بدات ، چونكە زۆر بی بەزەین بە زەیان بەو كەسانە نایەتەوە كە ئەهلی دۆزەخن هەرچی فەرمانیان پی بدریت ئە نجامی دەدن ..!!**

**هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾**التحريم ٦ .واتا: ئەی ئەو كەسانەی كە باوەرتان هیناوە خۆتان و كەس وكارتان بپاریزن لە ئاگریك كە سووتەمەنیە كەی خەلكی و بەردی گۆگردە ، سەرپەرشتیاری ئەو دۆزەخە و ئاگرە ، جۆرە فریشتەیەكن كە زۆر دلرەق وتوندو تیژن .نا فەرمانی خوا ناكەن لە هیچ شتیكدا كە فەرمانیان پی بدات و هەرچی فەرمانیكیان پی بدریت ئە نجامی دەدەن ..!!**

**(خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿وَقَالَ الَّذِينَ فِي النَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ادْعُوا رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِنَ الْعَذَابِ﴾**غافر ٤٩ . واتا : ئینجا ئەوانەی كە لە ناو ئاگری دۆزەخدان بە فریشتەكانی سەرپەرشتیاری دۆزەخ دەلین : دوا لە پەروەردگارتان بكەن ، تەنها رۆژیك سزاو ئازارمان لەسەر سووك بكاتەوە ..!؟**

هەروەها ژمارەی سەرپەرشتیاری خزینەی مالی جحیم (١٩) فریشتەی بەهێزو دل رق توندو تیژن هیچ بە زەیەکیان نیە بەو کەسانەی کە بەهۆی گوناهو تاوانەکانیانەوە میوانی مالی جحیم بوون بۆسزا دان و ناخۆشیەکانی ئەم مالە کە سەرئە نجامی هەموو ستەم کاریکە ،کە لەدونیادا ستەمی لە خەلك کردووە ..!!

هەروەها (خوای گەورە ) دەفرموویت : ﴿عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ﴾المدثر ٣٠ . واتا : (١٩) فریشتە سەرپەرشتی دۆزەخ دەکەن ،یان کارو باروی ئاگری دۆزەخ رادەپەرینن ..!!

هەروەها بی باوەران دەلین: ژمارەیان کەمە ئەوانەی سەرپەرشتیاری مالی جحیم ، کەچی نازان و تی نافرکن کە فریشتەکانی خوای گەورە ، چەندە بەهیزو گەورە و زەبەلاحن هەر یەکیکیان دە توانیت سەرپەرشتی هەموو کافرانی یان تاوانبارانی یان هەموو ستەم کارانی سەر زەوی بکات بەبی هیچ کەم کوری ، چونکە گەورەی هەریەکیکان لە فەرموودەیەکی پغەمبەری ئازیزمان دا هاتووە کە دەفەرموویت : ((إن لي أن أحدث عن ملك من ملائكة الله تعالى من حملة العرش ،ما بين شحمة إلى أذنه عاتقة مسيرة سبعمائة سنة )) . سلسلة الاحاديث صحيحة ١٥١ . واتە : ریم پی دراوە کە باسی فریشتە یەك بکەم لە فریشتەکانی خوای گەورە لە هەلگرانی عەرشی خوایە ، لە نیوان نەرمایی گویی تا شانی حەوت سەد سال ریيە .

هەروەها ناوی سەۆرکی گەورەی فریشتەکانی سەرپەرشتیاری خزینەی مالی جحیم ناوی (مالك )

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُمْ مَاكِثُونَ﴾الزخرف ٧٧. واتا : واتا : دۆزەخیەکان هاوار دەکەن ، ئەی مالك (کە فریشتەی سەرپەرشتیارە ) دەبا پەروەردگارت بمان کوژیت ، دە با بمرین و کۆتایی بەم سەغلە تیەمان بیت، لە وەلامدا دەلیت: بەراستی ئەوە قورئانە باسی بەختەوەران و باسی بەدبەخت و نا پوختەکان دەخاتە بەر چاو ، ئەو سا دیتەوە بۆ دنیا و دەیەویت پیش ئەوەی ئەو رۆژە بەرپا ببیت خەلکی فریای خۆیان بکەون ..؟!!

هەروەها یەکیکی تر لەفریشتەکانی خزینەی مالی جحیم ئەویش ناوی (زبانیە ) تەنها سزای بی باوەران و ئەوانەیەی ستەمیان لەخەلکی کردووە ، کە (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ (١٧) سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ﴾ العلق ١٧-١٨ .واتا : ئینجا وازی لی بهینە ،با هاوەل و هاوبیرو باوەرانی بانگ بکات و کۆیان بکاتەوە بۆ دژایەتی ئیمانداران ..!!ئیمەش فریشتەی سەرپەرشتیاری دۆزەخی بۆ بانگ دەکەین تا تۆلەی بسینیت و لە دۆزەخ توندی بکەن ..!!

بی گومان سیفەتەکانی فریشتەکانی دۆزەخ رەق بوونیان زۆرە لە چاو فریشتەکانی تری (الله) تعالی ،چونکە بەگشتی فریشتەکانی خوا سیفاتی تایبەتیان هەیە بەلام ئەوانەی مالی جحیم جیاوازن رقیان زۆرە لە تاوانباران و بی باوەران ستەمکارانی سەر زەوی ، بە هیچ شیوەیەك رحمیان نیە بەزەیان پی ناکەن زۆر رەق لەدلن بەرانبەرایان قین تووڕەیان زۆرە ،چونکە بی فەرمانی پەروەردگاریان کردووە ، هەورەها (خوای گەورە) جیاواز لە فریشتەکانی تر دروستی کردوون ، هەرکەسیك بیان بی نیت ئەترسیت دە گری لە ترسان ،ئەوانە ئیش و کاریان سزا وئیش ئازاری ئەهلی دۆزەخە دەدن و ئاگری دۆزەخ خۆش دەکەن ،وا دورست کراون لاشەو بەدانیان زۆر زەخم وبەهیزە بەقوەتە ،هیچ بەزەیەکیان نیە ، تەنها بۆ سزادان ئیش ئازاری دۆزەخیە کان خوای گەورە دروستی کردوون :

هەروەها ئەهلی مالی جحیم لە (٣) چیتن پیك هاتوون ئەمانەن :

١-(خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنْذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا بَلَى وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ (٧١) قِيلَ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ﴾ **الزمر ٧١-٧٢**.

٢-(خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ (٨) قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ (٩) وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ (١٠) فَاعْتَرَفُوا بِذَنْبِهِمْ فَسُحْقًا لِأَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾**الملك ٨-١١**.

٣-(خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿وَقَالَ الَّذِينَ فِي النَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ادْعُوا رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِنَ الْعَذَابِ (٤٩) قَالُوا أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُمْ بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا بَلَى قَالُوا فَادْعُوا وَمَا دُعَاءُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ﴾**غافر ٤٩-٥٠**

## سوتەمەنی مالی جحیم :

**بی گومان سوتەمەنی مالی جحیم بریتیە : لە مرۆڤ بەردی گۆگرد کە تییادا لە ناو ئەم ئاگرە گەورەی دۆزەخ دەستووتیت بە هۆی زیاتر چوونە ناوی مرۆڤ ئاگرە کە زیاتر گر دە گریت بەردی گۆگرد زیاتر دەسوتیت، هەروە کو ( خوای گەورە ) لە قورئانە پیرۆزەکەی دەفەرموویت :** ﴿فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾**البقرە٢٤. واتا : خۆ ئەگەر نەتوانیت هەر گیز نایشتوانن لە ئایندە شدا ناتوانین ، دەی کەوابوو خۆتان بپاریزن لە وئاگرە : کە سووتەمە نیە کەی خەلك و بەردە ، کە ئامادە کراوە بۆ بی باوەران و کافرو خوا نە ناسان ..!!**

**جا ( خوای گەورە ) دە توانیت هەموو شتیك بکات بە سووتەمەنی دۆزە بەلام جستەی مرۆڤ بەردی ( گۆگرد ) زۆر گەرمە زوو تر گر دە گریت بونی زۆر ناخۆشە و پیستی مرۆڤ زۆتر دەستووتینیت ..!!زانایانی ئاینی ئیسلام ئەلین :ئەو بەردە ( بەردی گۆگردە )..!! هەروەە دە ووتریت : پینج سیفاتی هەیە : یەکەم : ئیش و ئازار زیاتر دەکات ،دووەم : زوو دادەگیرسیت ، سی یە م : بۆنی زۆر ناخۆشە . چوارەم : زۆر دووکەل دەکات ، پینچەم : توند بە جستەوە دە نوو سیت و ، وە لە کاتی گرگرتنی تینی زۆر بە هیزو بە تەوە ..!!**

**هەروەکو ( عبداللە کوری مسعوود ) دە فەرموویت : ((** **هي حجارة من كبريت ، خلقها يوم خلق السموات والارض في سماء الدنيا يعدها الكافرين** **)) .رواه ( ابن جرير، و ابي حاتم ، والحاكم في المستدرك )**

**واتە : ئەمە بەردی گۆگردە ،( خوای گەورە ) دروستی کردووە کاتی ئا یمانەکان و زەوی درووست کردووە لە ئاسمانی یەکەم ئامادەی دەکات بۆ بی باورە کان ..!!**

**هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنْتُمْ لَهَا وَارِدُونَ﴾**الانبیاء ٩٨. واتا : بی گومان پییان دە ووتریت : ئیوە ئەوانەی کەدەی پەرستن وەکو بت صنم ،وە ئەوانەشی کە رازی بوون بیان پەرستن جگە خوا ، ئەوا وەك مرۆڤ و جنۆکە ، دەبنە خۆواگ و سووتەمەنی دۆزەخ ، هەر هەمووی دەچیتەن ناو دۆزەخ بۆ هەمیشەیی تیدا دە مینیتەوە ..!!!**

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ **التحريم ٦**. واتا : ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هیناوە خۆتان و کەسوکارتان بپاریزن لە ئاگریك کە سووتەمەنیەکەی خەلکی و بەردە ، سەرپەرشتاری ئەودۆزەخە و ئاگرە وجۆرە فریشتەیەکن کە زۆر دلرەق و توندو تیژن ، نافەرمانی خوا ناکەن لەهیچ شتیکدا کە فەرمانیان پی بدات و هەرچی فەرمانیکیان پی بدریت ئە نجامی دەدەن ...!!

هەروەها ( پیغەمبەری ) خوا( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( نارکم هذه التي ابن آدم من سبعين جزاء ، من حر جهنم )) . **صحيح مسلم رقم ٢٨٤٣** .واتە :ئەو ئاگرەی کە مرۆڤ لە ژیانی دونیا دا ،دای دە گیر سینیت یەك بەشە لە حەفتا بەشی ئاگری مالی حجیم ..!؟

هەروەها لە فەرموودەیەکی تر پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دا هاتووە دەفەرموویت : (( أشتكت النار إلى ربها فقالت : أكل بعضي بعضا ، فأذا لها بنفسين : نفس في الشتاء ونفس في الصيف ،فأشد ما تجدون من الحر ، وأشد ما تجدون من الزمهرير )). **متفق عليه رواه البخاري ٣٢٦٠** .

واتە : ئاگر سکالای بردە لای ( پەروەردگار ) ووتی : هەندیکم هەندیکی خوارد ، ( خوای گەورە ) ش ریگەی پی دا کە دوو نەفس بدات : نەفسیك لە زستاندا و نەفسیك لە هاویندا ، جا تو ترین ئەو گەرمایەی کە هەستی پی دەکەن لە گەرمی دۆزەخەوەیە و توند ترین ئەو سەرمایەشی کە هەستی پی دەکەن لە زەمهەریرەوە یە..!!

## درکات مالی جحیم :ئەوکەسانەی بۆ هەتاهەتایی دەمینەوە ..؟!

بی گومان جیاوازی هەیە لە توندی بەهیزەی مالی جحیم لە چینەکانی ،هەروەك ئەوانەی لە چینەکانی خواری خوارە وە ی ئاگری دۆزەخن ( خوای گەورە ) لە قورئانە پیرۆزە کەی دا دەفەرموویت ( الدرك الاسفل ) ئەوانە ئەو کەسانەن کە دوژمنی خوا و پیغەمبەرەکەین ( صلى الله عليه وسلم ) ..!!

١-هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا﴾ النساء ١٤٥ .واتا : بەراستی دوو رووە کان ، لە چینی هەرە خوارەوە ی ناو مالی دۆزەخ دان ، و هەرگیز بۆ ئەوان پشتیوانیکت دەست ناکەویت ..!!

هەروەها مالی جحیم پلە پەلەیە درجەی هەیە ، هەروە ك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِمَّا عَمِلُوا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ﴾الانعام ١٣٢ .واتا : بۆ هەر یەکیك لە بی باوەران و موسلمانان چەندها پلە وپایە هەیە لە پاداشتی کردەوە کانی ، پەروەردگاریش بیئاگا نیە لەو کارو کردەوەی کە دەیکەن ..!!

٢-فرعون وقەومەکەی : ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ﴾غافر ٤٦ . واتا :ئاگری دۆزەخە ، بایانیان و ئیواران ،نیشانیان دەدریت ، یاخود پیایاندا دەچژینریت ،لە جیهانی بەرزەخدا رۆژی قیامەتیش فەرمان دەدریت : ئادەی تاقم و دەستەی فیرعەون بخەنە ناو ئیش و ئازاری زۆرە ناخۆشەوە ..!!

هەروەها: ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَى عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمْ مِنْ عَذَابِهَا كَذَلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ﴾فاطر ٣٦ .

واتا : ئەوانەشی کە بی باوەر بوون ، بە ( خوای گەورە ) پیغەمبەرەکەی ( صلى الله عليه وصلم ) ئاوا ئاگری بلیسەداری مالی جحیم بۆ یان ئامادەیە ،بریاری مردنیشیان بۆ نادریت تاکو ئیسرحات بکەن ،سزاو ئیش ئازاریشیابۆ سووك ناکریت و کەم ناکریتەوە ، (ئابەم شیوەی سزایی ( خوای گەورە ) ئامادەیە بۆ بی باوەران و خوانەسانان زالم و ستەم کاران )..!!

٣-ژنەکی نوح ژنەکەی لوط ، کە ئەم دوو ئافەرتە ( خوای گەورە ) سزایی بەئیش و ئازاری بۆ ئامادە کردوون لە مالی جحیم دا ،بە هۆی بی باوەریان و تاوانەکانیان بەرانبەر بەم دوو پیغەمبەرە ( علیهم السلام ) هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَةَ نُوحٍ وَامْرَأَةَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ﴾التحريم ١٠ . واتا : ( خوای گەورە ) نموونەی هیناوەتەوە : بە ژنەکەی ( نوح ) بە ژنەکەی ( لوط ) بۆ ئەوانەی کەبی باوەربوون ، کە ئەو دوو ئافەرتە هاوسەری دوو بەندەی چاك و پاکی ئیمە بوون ،کەچی خیانەتیان لی کردن باوەریان پییان نەبوو ،غەیبەتیان دەکردن ، گالتەیان پی دە کردن .. ئیتر ئەو پیغەمبەرانە فریای هاوسەرەکانیان نەکەوتن ، لە قیامەتدا بەو ژنانە دەوتریت : بچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە لەگەل ئەوانەدا کەدەچنە ناوی ..؟!؟!

٤-جوولە گەو گاورە کان ئەوانەی باوریان بە هەندیك لە کتابە کانیان هەبوو یان ئەوانەی باوەرینا پی نەبوو ، گاورە کانیش هاوەلانی المائدە ..؟!

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاءُ مَنْ يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنْكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ البقرە ٨٥ .واتا :کەوایە چۆن دەبیت باوەرتان بە بەشیکی ( تەورات هەبیت ) باوەرتان بە بەشەکەتری نەبیت ؟! ئایا پاداشتی ئەوەتان کەئەوکارە دەکات جگە لە سەر شۆریی و سووکی نەبیت لە ژیانی دونیادا هچیی تر هەیە ؟! لە رۆژی قیامەتیشدا دەگەرینەوە بۆ ناو سەختترین سزاو، خوایش بی ئاگانیە لە کارانەی کە ئیوە ئە نجامی دەدەن ..؟!

( خوای گەره ) دەفەرموویت : ﴿إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَنْ يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ قَالَ اتَّقُوا اللَّهَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ (١١٢) قَالُوا نُرِيدُ أَنْ نَأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَنْ قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ الشَّاهِدِينَ (١١٣) قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنْزِلْ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِأَوَّلِنَا وَآخِرِنَا وَآيَةً مِنْكَ وَارْزُقْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ (١١٤) قَالَ اللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَنْ يَكْفُرْ بَعْدُ مِنْكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَابًا لَا أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ﴾ **المائده ١١٢-١١٥ .واتا : كاتيك حەواريەكانى عيسى ووتيان : ئەى عيسى كورى مەريه م ، ئايا پەروەردگارى تۆ دە توانيت لە ئاسمانەوه سفره و خوانيكمان بۆ دابەزينيت ..؟! عيسى ووتى : لە خوا بترسن ، ئەگەر ئيوه ئيماندارن ( ئەمە چ داخوازيه كه دەى كەن ..!! حەواريەكان بۆ پاساوى دەوا كەيان ووتيا : دە مانەويت بۆ پيرۆزى و بەرەكەت لى بخۆين و دلنيا بين و چاك بزانين كه بى گومان راستت لە گەلدا كردووين ..!! ولە سەريشى ببينە شايەت تا ئەوە ى باوەرى هەيە باوەرى دامەزراو تر بيت ..!! ئينجا عيسى كورى مەريم ووتى : ئە خواى پەروەردگا لە ئاسمانەوه سفره و خوانيكمان بۆ دابەزينە تا ببيتە چەژن بۆ نەوەكانى ئيستا و داهاتوومان و بەلگە يەك بيت لەلايەن تۆوه بۆ پيغەمبەرايەتى من و دەسەلاتى بى سنوورت و لە رزق و رۆزى بەهرەوەرمان بكە ، هەر تۆى چاكترين رۆزى بەخش ..!!ئينجا ( خواى گەوره ) فەرمووى : بەراستى من ئەوسفره و خوانە تان بۆ دادەبەزينم ،جا ئەوى=ەتان دواى دابەزاندنى سفرەو خوانەكە بى بروابيت ، ئەوا بەراستى من سزايەكى دەدەم كەسزاى هيچ كەسيكم لە جيهاندا ئاوا نەدا بيت ..؟!!**

**٥-( ئەبو لەهەب و ژنەكەى ) هەروەك ( خواى گەوره ) دەفەرموويت :** ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ (١) مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ (٢) سَيَصْلَى نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ (٣) وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ (٤) فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ﴾ **المسد ١-٥ . واتا : دەستە كانى بشكيت ( ئەبو لە هەب ) ريسوا بيت ، ئاشكرايه كه هەر ريسواو سەر شۆريش دە بيت و لە نا دەچيت ..!!مال داراى ئەو شتانەى كه بەدەستى هيناوه ، بە هانانى يايەت و فريايى ناكەويت ..!!لە دا هاتوودا دە خريتە ناو ئاگريكى بليسە دارە وه ..!!هەروەها ژنەكەشى كه هەلگرى كۆلە كەدارە و ئازاى پيغەمبەرى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەدات ..!! هەميشە گوريسكس چنراو لە پوشى خورما لە گەردنيايەتى لە قيامەتيش دا زنجيرى ئاسن دەكريتە گەردنى ..!!**

٦-(کافرو بی باوەڕەکان ) ئەوانەی شریکی گەورە بڕیاردەدن کوفر دەکە دوژمنانیەتی خوا پێغەبەرەکەی دەکەن گوران بە ئاینی خواو پیەمبەرەکە :

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنْذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا بَلَى وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ الزمر ٧١ .واتا : ئەوسا ئەوانەی کە بی باورو کافرو بوون ، را پیچ دەکرین بەرەو دۆزەخ دەست دەستەو تاقم تاقم دەگۆز رینەوە ، تاکاتیك دە گەنە بە ردەگاکانی مالی جحیم ..؟! هەموویان خەم خەفەت دە خۆن لە بەردەم دەرگای مالی جحیم دا ، دوای ماوەیە بۆ یان دەردەکەویت ، ئینجا فریشتەی سەرپەریشتیار بە پرس قسەیان پی دەلیت و سەرزەنشتیان دەکات دەلیت : مەگەر پیغمبەران لە خۆتان رەوانە نە کرابوو بۆتان کەئایەتەکانی پەروەرگاری خۆتان بەسەر دا بخوینیتەوە و یادە وەریتان بکات و داتان بچلە کینیت لە گەیشتنی ئەم رۆژە واتا (یوم الحیساب ) ..؟! بەدەم ئاخ و نالەوە دەلین : بەلی . بەلام تازە ، بەلی . سوودی نیە ..؟! بڕایاری سزاو ئازرا دراوە کافر و بی بڕواکاندا ..؟!

هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَمَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِهِ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا﴾الاسراء ٩٧ . واتا ئەو کەسەش خوا رینوویی بکات و (شایستەبیت ) ئەوە ئیتر هیدایەت دراوە و رینموویی ورگرتووە ، ئەوە ش کە سەرگەردانی بکات ، ئەوە هەرگیز کەسیکت دەست ناکەویت جگە لەو زاتە کە پشتیوانی بکات و رزگاری بکات و فریای بکەویت ،لە رۆژی قیامەتیشدا ئەو جۆرە کەسانە لەسەر روو کۆدەکەینەوە و لە کاتیك دا کویرو لال و کەرن ، ئەوانە شوینیان نا ئاگری دۆزەخە، هەرکاتیك بلیسە کوژایەوە ،بلیسەی زیاد دەکیەنەوە بۆ یان ..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ لقمان ١٣ . واتا : جا لقمان بە کورە شیرنەکەی خۆی ووت : ئەی کوری شیرینم : ( لە کاتیکدا کەئامۆژگاری دەکرد )، نەکەیت شتیك یان کەسیك بە هاوتاو هابەشی خوا بڕیار بدەیت ، چونکە بەراستی هاوتاو هاوبەش بڕیاردان ستەمیکی زۆر گەورە و نارەوایە ..؟!

٧-(المتكبرين ) واته : ( خۆ بەگەورە زان ،و یان خۆ بەزل زان یان، لووت بەرزەکان )

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿قِيلَ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ﴾الزمر ٧٢ . واتا :بە خۆ بەگەورە زان و بە لووت بەرزەکان دەوتریت : دە ی ئیتر لە دەرگاکانی دۆزەخەوە برۆنە ژوورەوە ،بچنە ناو ژیانییکی زۆر ناخۆش و سەخت دژوار بۆ تان ئامادە کراوە بەردەوامە ،مرنیش نیە ئای چەند ناسازو جیگەو ریگەی لوو ت بەرزو خۆ بەزل زانەکان بۆ هەتاهەتایی و هەمشەیی دەمینەوە ..؟!!

هەروەها ( خوای گەرورە ) دووجاری تر ئەم ئایەتەی دووبارە کرتەوە چونکە زۆر تاوانیکی گەورە و پیش قیزەونە هەروەك دەفەرموویت :﴿ فَادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَلَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ﴾النحل ٢٩ .

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ﴾٧٦ .

هەروەها لە صحیح مسلم دا هاتووە کە پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر ، الكبر بطر الحق ، وغمط الناس )). رواه مسلم رقم ( ٩١ )

واتە : ناچیتە بەهەشتەوە ئەو کەسەی بە ئەندازەی مثقال ذرة ،یان ئەندازەی قورسی گەردیلەیەك خۆ بەگەورە زانین لە ناخیدا هەبیت ..؟! خۆبە گەورە زانینیش بریتیە لە لە رەت کردنەوەی حەق ، وە خەلك بە کەم زانین یان بە سووك دانانی بەرانبەرەکەی ..؟!

هەروەها پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفرموویت : (( يحشر المتكبر يوم القيامة أمثال الذر في صور الرجال يغشاهم الذل من كل مكان )).سنن الترمزي برقم ( ٢٤٩٢ ).

واتە:خۆ بەگەورە زانە کان ولووت بەرزەکان لەرۆژی دواییدا وەکو میرولە وردەکان حەشر دەکرین لەسەر شیوەی مرۆڤدا کە زەلیلی سەرشۆری لەهەموو لایەکەوە دەیانگریتەوە ..!!

٨-( المجرمون ) ئەوانەی تاوانی گەورە ئەنجام دەدەن باوەر بە رۆژی لێپرسینەوە ناکان بەدرۆی دەزانن ..؟!

( خوای گەورە ) دەفەرموويت: ﴿هَذِهِ جَهَنَّمُ الَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا الْمُجْرِمُونَ (٤٣) يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ آنٍ﴾الرحمن ٤٣-٤٤ . واتا : ئەوە ،ئەم دۆزەخەیە تاوانباران باوەریان پی نەبوو ..؟!جا لەنێوان ئاگرو ئاوی گەرم دا کە بەسەر چاوەیاندا دەکریت هەر دە خولێنەوە ..!!

٩-( جبار عنيد )ئەو کەسانەی ستەمکاری سەرسەخت و عینادی و ئەنکاری لەحەق دەکەن بەرگری لە ناحەقی دەکەن )

هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿وَتِلْكَ عَادٌ جَحَدُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْا رُسُلَهُ وَاتَّبَعُوا أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ﴾ هود ٥٩. واتا : بەلی . ئەوە هۆزی عاد بوو ، بی باوەرە بوون و ئیمانیان نەهینا بە فەرمانەکانی پەروەردگاریان ، لا شیاندا لە بەرنامەی پیغەمبەرانی خواو شوین فەرمانی هەموو زۆردارو وسەرسەخت و خوان ناسیك کەوتن ..؟!

١٠-(کوشتنی نەفسیك بە ناحەق ) یان (قتل الناس متعمدا )، کە( خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾ النساء ٩٣.

واتا: هەرکەسیك کەسیك بکوژیت بە ئەنقەست و متعمدا بە ( حەلالی بزانیت ) کوشتنی ئەو ئیماندارە ، ئەوا عاقیبە ت سزاو تۆلەی ئەو کە زە مالی جحیم بۆ هەمیشە یی و هەتا هەتایی تیدادەمینیتەوە ،هەروەها ( خوای گەورە ) لی توورە بووە نەفرینی لعنەتی لی کردووە سزایی گەورە و بی سنووری بۆ ئامادە کردووە ..؟!

١١- ( خۆکوشتن ) :

بی گومان خۆ کوشتن تاوانیکی زۆر گەورەیە بۆ خاوەنەکەی کە ئەنجامی دەدات هەروە ك لە فەرموودەیەکی بوخاری و مسلم دا هاتووە کە لە ( ابو هريره ) وە بۆمان دەگیرنەوە کە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : (( من قتل نفسه بحديدة فحديدته في يده يتوجا بها في بطنه في نار خالدا فيها أبدا ، ومن شرب سما فقتل نفسه فهو يتحساه في نار جهنم خالد فيها ، ومن ترى من جبل نفسه فهو يتردى في نار جهنم خالد مخلدا أبدا )) . متفق علية رواه البخاري ومسلم ،برقم ( ٥٧٧٨ )، ( ١٠٩ )

واته : هەرکەسیك خۆی بە ئاسنیك بکوژیت ئەوا ئاسنەکەی بەدەستەوە یە و دەیکات بەسکی خۆیدا لە ناو ئاگری مالی جحیم دا بۆ هەتاهەتایی ، وە ئەوەی خۆی درمان خوارد بکات یان ژەهرخواردن بکات و خۆی بکوژیت ، ئەوا بەردەوام ئەو ژەهرەی دەرخواردی دەدریت ، لە ناو مالی جحیم دا ،بۆ هەتا هەتایی ،وە ئەوەشی خۆی لە شاخیدا بەر بداتەوە و خۆی بکوژیت ئەوا لەناو مالی جحیم دا بۆ هەتاهەتایی بەردەوام بەردە دریتەوە لەشاخ دا ..؟!

١٢-( رباء ) واته : ( سوو خواردن ) کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا فَمَنْ جَاءَهُ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّهِ فَانْتَهَى فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا﴾ البقره ٢٧٥ .واتا :ئەوانەی کە سوو دەخۆن ،هەلسو کەت ناکەن و راست نابنەوە لە گۆردا مەگەر وەك ئەو کەسەی کە شەیتان دەستی لیوە شاندییت هەر لە دونیادا سروشتی نین ، لە قیامەتیشدا وە شیت دەبن ، چونکە ئەوانە دەلین : کرین و فرۆشتن وەك سوو وایە ( لە کاتکیدا ) ( خوای گەورە ) : کرین فرۆشتنی حەلال کردووە سووی حەرام کردووە ، جا ئەوەی ئامۆژگاری پەروەردگاری پیگەیشت و وازی هینا ، ئەوەی دەستی کەوتووە بۆ خی ، کاری کاری لی پرسینەوەشی دەکەویتە لای خوا ، بەلام ئەوەی دەست بکاتەوە بە ( سوو خۆریی ) ئا ئەوانە لە نیشتەجیی ناو ئاگری دۆزەخن ژیانی هەمیشەیی بۆ هەتاهەتایی دەبەنەسەر ..؟!

١٣- (ئەوكەسانەی گوناهو تاوانی زۆر گەورە جۆراو جۆر ئە نجام دەدن ستەم کارن زالم و تاوانبارن هەرەها بی باورەن کوفر دە کەن درۆدەکەن ،ئەوانە ناو زگیان رەشەو ،رووخساریا رەش بوو لە دونیاو قیامەتدا ، هەروە ك شەویکی زۆر تاریکی رەش وان ):

﴿ وَالَّذِينَ كَسَبُوا السَّيِّئَاتِ جَزَاءُ سَيِّئَةٍ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ مَا لَهُمْ مِنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ كَأَنَّمَا أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِنَ اللَّيْلِ مُظْلِمًا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ یونس ٢٧ .واتا : ئەوانەش گوناهو تاوانەکانیانی زۆر گەورە ئە نجادەدن ،هەرچەندە پاداشتی گوناهو تاوانیك بەقەدەرخۆی دەدریتەوە ،(بەلام کەندیك کەس ئەوەندە تاوانبارن خەجالەتی سەر شۆری و روورەشی ئەوەندە ماندووی کردوون کەس نیە پەنایان بدات بیانپاریزیت لە ( خەشم و قینی ) ( خوای گەورە ) ئەوەندە روو رەشن، هەر دەلیی پارچەیە لە شەوی تاریك رووخساری دا پۆشیوون ، ئائەوانە نیشتە جیی ناو ئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشە ژیان لە ناو مالی جحیم دەبەنەسەر ..!!

١٤-(ئەو کەسانەی نەیاران دوژمنایەتی خوا پیغەمبەرەکەی دە کەن ) وەك ئەوانەی کە لە حزبی شەیتانەکانن یان ئەوانەی بە مال و نەوەکانیانەوە دژایەتی خواو پیغەمبەرەکەی دەکەن ، کاتیك کۆدەبنەوە غەیبە تی خەلك دەکەن ،وە لە نزاو پارنەوەیان لەبیر کردووە غافل لە یادی ( خوای گەورە ) هەر بەدوای ژیانی دونیا کەوتوون .

﴿ لَنْ تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾المجادلە١٧ . واتا : نەمال وسامانیان نەرۆلەکانیان هەرگیز نابنە هۆی ئەوەی کەلە دەست تۆلەی خوا رزگاریان بکات ، ئەوانە نیشتەجیی نا ومالی جحیم یان دۆزەخن و تیایدا بۆ هەمیشەیی وهەتا هەتایی بە زیندوویی دەمینەوە ..!!

## كين ئەو كەسانەى دەچنە مالى جحيم : تيدا سزادەدريت پە پى كردەوە كانيان بەلام بۆ هەتاهەتايى نامينەوە ..؟!

بەلى ئەو كەسانەى دەچنە مالى جحيم كە تيايدا سزا دەدرين بەهۆى كردەوەكانيان لە مالى دونيادا دەچنە ژوورەوە بۆ مالى جحيم ،ئەو كەسانەن كەدواى هاتنى رۆژى _قيامەت – ولپرسينەوە –يوم الحيسبا- يان دادگايى كردنى مرۆڤە كان بە هۆى كردەوە گوناهو تاوانەكانيان لە ژيانى دونيادابە توند ترين شيوە پى سزا دە درين ، بەرە و مالى جحيم را پيچ دە كرين بى گومان تاوانى زۆر گەورەيان هەيە كە دە بيت مرۆڤى موسلمان خۆى لەم تاونە گەوران بپاريزيت كە پى را پيچ دە كريت بۆ مالى جحيم ،ئەو تاوانانەش زۆر گەورەن و لە چاكە كانيان دا زۆر ترە سزاى گەورەى بۆ دانراوە لە رۆژى لى پيچينەوەدا –يوم الحيساب – تەرازووى چاكەكانى سووك كردووە ،بەهۆى گەورەيى تاوانەكانيا كە ئە نجاميانداوە ، پاش سزادانيا بە هۆى شەفاعەتى شەفاعەت كران دردەهينرين لە مالى جحيم ،بەلام هەر ( خواى گەورە )زانايە بە ماوەى سزادانە كەيان كەچەندە لەمالى جحيم دە مينەوە هە تا دەبنە بە خەلووز بۆ ماوەيەك تاكو سزاكانيان تەواو دەبيت جيگەو شوينيان مالى جحيم دەبيت ، هەروەك لە فەرموودەى پيغەمبەرى خوا( صلى الله عليه وسلم ): (( يعذب ناس من أهل التوحيد في النار حتى يكونوا فيها حمما ثم تدركهم فيخرجون ويطرحون على أبواب الجنة )) .سنن الترمذي برقم ( ٢٥٩٧ )وهو في صحيح جامع برقم ( ٨١٠٣ ).

واتە : كەسانيكى تاوانبارى لە أهلى توحيد و يەكخواپەرستى لە ناو مالى جحيم دا يان ئاگرى دۆزەخ دا دەمينەوە هەتا دە بن بە خەلووز پاشان رەحمەتى خوا پييان دەگات و دەر دەكرين لاى دەرگاكانى مالى نعيم يان مالى بەهەشت ..!!

بەلی ئەم تاوانانەی كە بەلینی ئاگریان لەسەر بەلام خاوەنەكەی بۆ هەتاهەتایی لە ئاگردا نامینەوە ، ئەمانەی خوارەوەن :

١-ئەو گروپانەی كە پیچەوانەی سوونەتی پیغەمبەری خوان (صلی الله علیەوسلم ) لەم فەرموودەیەی پیغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) باسی دەستەیەك لە رزگاربووە كان دەكات دەفەرموویت : (( كلها في النار إلا واحدة )) .سنن ابن جاجه برقم ( ٣٩٩٣ ).

٢-ئەوكەسانەی ستەم دەكەن لە فەرمانرەوایی و حوكم ودادوەری ،كاربەدەست و بەریوەبەری هەرشوینیك بیت یان سەرۆك وەلاتی هەر وەلاتیك بیت یان وەزیریك بیت یان بەرویوە بەریك بیت لە فەرمانكە كەی خۆی حكم ودادوەری تیدا بكات لەنیوان هاولاتیان و خەلكە كەیدا ، هەروەك ئەم فەرموودەیەی پغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( القضاة الثلاثة : واحد في الجنة ،واثنان في النار فأما الذي في الجنة فةرجل عر الحق فقضى به ، ورجل عرف الحق فجار في الحكم ، فهو في الجنة ، ورجل قضى للناس على جهل هو في النار )).سنن ابي داود برقم ( ٣٥٧٣ ).

هەروە ئەم سی ئایەتەی سورەتی مائدە كە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :

﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾المائده ٤٤.

﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾المائده ٤٥ .

﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾المائده٤٦ .

بەلی بیگومان هەر كەسیك یان هەر كاربەدەستیك یان هەر حاكمیك و دادوەریك حوكم و دادوەری نەكان بە وەی كە خوا پیغەمبەرەكەی بۆ یان بەیان كردووە یان پی یان راگەیاندوە ئەوا یەكیك لەم حوكمانەیە بەرسەر دا دە سە پیت بە پی حوكمی ئەم سی ئایەتە دا جا ئەوەی كە تیدا ئیجتهادی كردوو لەخوا ترسان ئەوا لە كۆمەی رزگا بووانە ئەوەشی حكمی خواو پیغەمبەرەكەی ( صلى الله عليه وسلم ) گۆری بۆ بەرژەوندی خۆی و بەرژەوەندی سەركردەكەی یان فەرمانرەواكەی ئەوا دەكۆمەلی كافرانە حكمی ( خوای گەورە ) پیغەمبەركەی گۆریوە ئەوە شی تیدا بە ناحەق حوكمی كرد لە بەرژەوندی خۆیدا یان دەسەلات فەرمانرەواكەی ئەوا لە كۆمەلی ستەمكارانە ،ئەوشی حكمی دەركرد بە بە نەزانی جاهلی غافل بوون لە حكمی ( خوای گەورە ) ئەوا لە كۆمەلی فاسقانە ..!!

٣-درۆکرن بەناوی ( خوای گەورە )و بەنای پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) :

( خوای گەورە ) دەفرموویت : ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾الانعام ٢١.واتا:جا کی هەیە لە و ستەم کارتر بیت ، کە شتی نادرست و درۆ بۆ ( خوای گەورە ) هەلدەبەستیت ..؟ یان ئایەت و فەرمانەکانی خوا بەدرۆ دەزانیت ..!؟ چونکە بەراستی ئەو ستەم کارنە سەرفراز نابن ..!!

هەروەها( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ أُولَئِكَ يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُمْ مِنَ الْكِتَابِ حَتَّى إِذَا جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوْنَهُمْ قَالُوا أَيْنَ مَا كُنْتُمْ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ قَالُوا ضَلُّوا عَنَّا وَشَهِدُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا كَافِرِينَ﴾الاعراف٣٧ .واتا : جا کی لەوە ستەمکارترە کە بەدەم خواوە درۆ هەلدەبەستیت ، یان بڕوای بەئایەتەکانی نەهیناوە ، ئا ئەوانە ئەوەی کە بۆیان بڕیار دراوە لە دونیا دەستیان دەکەویت ، هەتا ئەوکاتەی فریشتە نیردراوەکانمان بۆ یان دین گیانیان دەکیشن ،ئەوسا پییان دەلین : کوان ئەوانەی جگە لە خوا هانا و هاوارتان بۆ دەبردن دەتا پەرستن ..؟! ( بەسەرسامیەوە..!! ) دەلین ( نازانین ) لیمان ونبوو ، ( ئەوسا بە ناچاری ) شایەتی لە خۆیان دەدەن کە بەراستی ئەوان هەر بی باوەر بوون ..!!

هەروەها لە فەرموودەیەکی صحیح دا هاتووە لە ( علی ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت پغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( لا تكذبوا علي فإن من يكذب علي يلج النار )).متفق عليه رواه البخاري برقم ( ١٠٦ ) ، ومسلم برقم ( ١ ) . واتە : ئەوەی بەناوی منە دۆربکات دەچیتە ناو مالی جحیم یان ..!!

٤-خواردنی مالی خەلك بە نارەوا و بەناحەق یان خواردنی مالی دەولەت وەلات بەنارەوا بەناحەق بۆ خۆ دەولەمەند کردن کەچی مالی خەلکە نەمالی حوکمەتە مالی ئەوهەموو فەقیر هەژارانەیەیان مالی بی باوك هەتیوە کە حەقی لەلای ئەم حومەتە وئەدەست هەلاتەکە هە یە چۆن دەبیت دزی لە مالی حوکمەت بکریت و بە نارەوان یان حومەت دزی لەمالی خەلك بکان بەناحەق نارەوا ،یان ئەوکەسانەی مالی خەلك دەخۆن گویی بە حەلال و حەرام نادەن وەك ئاژەل رفتار دەکەن هەر خەریکی کۆکردنەوەی مال سامانن بە ناحەق بەنارەوە ئای جەند زولم ستەمیکی گەورەیە کە گویی بە مالی حەرام نەدەی کە دەی خۆیت یان ئەو کەسانەی کاربەدەستی حوکمەت لەریگەی پۆستەکەی مالی دەولەت دەدزی دەی خوات بە حەرامی گویشی پینادات نازانی ئەگەر لەدونیاش لی پیچنەوە دادگای کردن بۆی نیە بەلام لە رۆژی ( قیامەت ) بۆ کوی دە چیت هەی زالم وستەم کاری گەندەل دزوو جەردە ....؟!!!

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا (٢٩) وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ عُدْوَانًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا﴾النساء ٢٩-٣٠ . واتا: ئەی ئەوانەی باوەرتان هیناوە مال و سامانی یەکتر بە ناحەق و بەبی بەرامبەر مەخۆ لە نیوان خۆتاندا ، مەگەر بازرگانیەك بیت و لەسەر رەزامەندی هەموولایەکتان بیت ، خۆتان مە کوژن و یەکتر بە ناحەق مەکوژن ، کاتیك بیزاریی و بیتاقەتی رووتان تیدەکات یان تووشی زیانیك دەبن ، بەراستی خوا میهرەبانە پیتان ..!!هەر کەسیکیش کاری وابکات سامانی خەلکی بەناحەق بخوات یان خۆی یان خەلك بکوژیت ، بەدوژمنایەتی و ستەمکردن ، ئەوە کارەش بۆ خوا هەمیشە بەردەوام ئاسانە ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا﴾النساء ١٠ . واتا: ئەو کەسانەی دەست دریژی ئەکەن سەر مال و سامانی هەتیو ..!! و بەستەم و ناحەق دەیبەن و دەیخۆن ،با بزانین ئەوانە لە رۆژی دواییدا ئاگریك دەخۆن لە سکیاندا گردەگریت ، و دەرۆنە ئاگریکەوە گەرمیە کەی ئەچیژن ..!!

٥-ئەو کەسانەی کە جەلادن سزاو ئازاری بەئیش خەلکی بی گوناهو بی تاوان دەدە بە بە قامچی شتی تر بەستەمکاری ، هەروەها ئەو ئافرەتانەش کە جلیان لەبەر دایە بەلام رووت دیارن  چونکە لەبەر (تەسکی و یان کورتی جەلەکانیان لە بەریاندا ) ..!!

وە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( صنفان من أهل  النار لم أرهما ، قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون الناس ، ونساء كاسيات عاريات مائلات ، رؤسهن كاسنمة البخت المائلة )).صحيح مسلم برقم (٢١٢٨).

واتە : دوو جۆر لە ئەهلی ئاگر هەن من نەیا نمبینیوە  ئەوانیش ئەمانەن :

یەکەمیان : کەسانیکە کە قامچیان بەدەستەوە یە وەکو کلکی گا وایە  و پیی لە خەلکی دەدەن .

دووەمیشیان: ئافرەتانیکن جلیان لەبەردایە و رووتیشن (لەبەر تەنکی و یان تەسکی یان کورتی ) دلی پیاوان و گە نجانی هەرزەکار بەلای خۆیاندا رادەکیشن و ە بەلا نجەولارەوە بەریدا دەرۆن ولە حەق لادەدەن و قژیان بەشیوە یەك کۆدەکەنەوەوە و دەیبەستن وەکو سەرپشتی ووشتری مل دریژ ..!!

٦-ئەوکەسانەی ئازاری خەلکی دەدن چ لەریگای دەروونی خەلك چ لەریگای جستەی ئازاری موسلمانان دەدە یان ئەواتا بوختانیان بۆ دروست دەکە یا ئەوە تا ناو ناتۆرە لە خەلکی دە نین حەقیان بە ناحەق دە خۆن.

پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( إن أشد عذاب يوم القيامة أشدهم عذابا للناس في الدنيا )) . مسند ابو داود الطياسي برقم (١٢٥٣ ) و هو في صحيح الجامع برقم (٩٩٨).

واتە : سەخترین سزای خەلك ئەو کەسانەی کە سزای خەلکی لە رۆژی دواییدا ئەوانەن کە سەخترین سزای خەلکیان دواوە لە ژیانی دونیادا ..!!

٧-وه یەکیکی تر لەو سزایانەی کە هەرەشەی مالی جحیمی یان هەرەشەی ئاگری دۆزەخی لەسەر ئەو کەسانەی کە ئازارو سزای ئاژەلان دەدەن : مای تەواوەتی ئاژەلە کانیان نادەن یان لی یان دەدن یان برسیان دەکەن یان ئازاریان دەدن یان دەیان کوژن بە هەموو جۆرە ئازاریك ئەشكە نجەیان دەدەن ..!!

لە صحیح موسلم دا هاتووە لە ( جابره ) وە کە دەلیت : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( عرضت على النار ، رايت امرأة من بني إسلائيل تعذب في هرة لها ربطتها فلم تطعمها ، ولم تد عها تأكل من خشاش الأرض )) صحيح مسلم برقم ( ٤١٣٩ ).

واته :ئافرەتیکی بەنی ئیسرائیلیم بینی سزا دەدرا بەهۆی پشیلە یە کیەوە کەبەستبویەوە وخوادرنی پی نەدەدا و نەشی دەهیشت بۆ خۆی بروات خواردن پەیدا بکات و لە مار و میرۆلەی سەر زەوی بخوات ..!!

هەروەها لە سوونەتی نیسائی دا هاتووە لە( ابن عمره )وە دەلیت : بیستم لە پیغەمبەری خواوە ( صلی الله علیه وسلم ) دەی فەرموو: (( لعن الله من مثل بالحيوان )) . سنن النسائي ( ٤١٣٩ ).

واته : نەفرەتی خوا لەو کەسەی کە ئەندامی گیالەبەریك دەبریتەوە بەزیندوویی ..!!

٨-نەبوونی ئیخلاص لە پربوونی زانستی شەرعیدا : لە ( جابره )وە دەلیت : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویەتی : (( لا تعلموا العلم التباهوا به العلماء ، ولا لتمالاوا به السهاء ، ولا تخيروا به المجالس ،فمن فعل ذلك فالنار النار )). سنن ابن ماجه برقم ( ٢٥٤ ).

واته : فیری زانست مەبن بۆ ئەوەی خۆتانی پی هەلکیشن لای زانایان ، یان دەمە دەمی پی بکەن لە گەل نەزانو نەفامە کاندا ، وە یاخود بۆ ئەوەی پیش بخریت لە ناو مەجلیسدا و ئاماژەی بۆ بکریت ، ئەوەی ئەم کارە بکات ئەوا ئاگر ئاگری بۆ هەیە ..!!

٩-زەووت كردنی حەقی موسلمانیك یان بردنی حەقی یان پی نەدان ئەو حەقەی كەلە لایەتی جا چ لە لای كەسیك بیت یان ئەوە تا لە لای حوكمەت و كاربەدەست و دەولەت بیت ، كە حەقی شرعی خۆیەتی بە ئارەقەو ماندوو بوونی خۆی كاری بۆ كردووە یان ئەوەتا فەرمانبەر بووە كەچی مانگانە حەقەكەی پی نادریت و حەقی لی زەووت دە كریت بە نا رەوا بە نا یاسایی ..؟!

لە صحیح موسلم دا هاتووە لە (ابو ئومامەوە ) كە دەلیت : پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) فەرموویەتی : (( من اقتطع حق امرئ مسلم بیمینه ، فقد أوجب الله له النار ، وحرم علیه الجنة ، فقال له رجل : وإن كان شیئا یسیرا یا رسول الله ؟! قال : وإن قضیبا من أراك )) . رواه مسلم برقم ( ١٣٧ ).

واتە : هەركەسیك حەقی موسلمانیك بۆ خۆی ببات بە سویندیكی درۆ ، ئەوا ( خوای گەورە ) ئاگری مالی جحیم ی لەسەر واجب كردووە ، وە بەهەشتی لە سەر حەرام كردوە ، پیاویك ووتی : ئەگەر شتیكی كەم بچووكیش بیت ئەی پیغەمبەری خوا ؟ ( صلی اللە علیە وسلم ) ئەویش فەرمووی : ئەگەر دار سیواكیكیش بیت ..؟!

١٠- خواردنی مالی حەرام ، بە هەر جۆرەیك بیت ، جا چ زەووتی بكەی جا ج لەریگای پەلەو پایە و پۆستە كەوە وەری بگری پۆستەكەت بە كار بهینی بۆ وەرگرتنی مال و سامان و خۆ دەلەمەند كردن بە مالی حەرام یان ئەوەتا گویی بە حەرام نەدەی وە ئاژەل رفتار بكەی بۆ پر كردنەوەی سگی خۆی ، یان تیركردنی مال و مندالی لەریگای وەرگرتنی یان دزی نی مالی حەرام ، بەشتیك حەقی خۆت نەبیت بەحەقی خۆتی بزانی حەلالی بكەی بۆخۆت گویی پینەدەی لووشی بكەی ئەمە تاوانە هەرەشەی ئاگری لەسەر هەروەك ئەم فەرموودەیەی پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیەوسلم ) دەفەروویت : (( كل جسد نبت من سحت فالنار أولى به )). حلیة الأولیاء لأبي نعیم ج١/٣١.

واتە : هەر جستە یەك بە حەرام پیگەیشتبیت و گەشەی كردبیت ئەوا ئاگر لە پیشترە بۆی ..؟!!

١١- هەرکەسێك قسەیەکی یان ووتەیەکی ناشرین بە موسلمانێك بلێت یان بوختانێکی بۆ هەلبەستێك ئەوا ئەم قسەیە یاو بوختانە تیدا نەبێت ، وە سیناریو بۆ چاك کرابێت هیچ ئەصل ئەساسی ئەم قسەیە ویان بوختانە لە ئارادانەبێت ئەو دەخرێتە مالی جحیم ، لە جیاتی ئاو خواردنەوە لەسەر ئەم تاوانەی کە هەلی بەستووە بۆ برا موسلمانەکەی ،ئەوا لەجیاتی خواردنەوەی ئاوە ،خوێن کیماو شتی پیسی دەرخوارد دەکرێت لە ناو مالی جحیم دا لە لەناو ئاگری دۆزەخ دا ..؟!!

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( من قال في مؤمن ما ليس فيه أسكنه الله ردغة الخبال حتى يخرج مما قال )). سنن ابي داود برقم (٣٥٩٧ ).

واتە : هەرکەسێك شتێك بە موسلمانێك بلێت و تێیدا نەبێت ئەوا (خوای گەورە ) کیماوو خوێن ئاداب دەرهاویشتەی بۆگەنی ئەهلی دۆزەخ یام مالی جحیم دەرخواردی دەدات هەتا لەوەی وتویەتی دەردەچێت ؟!

١٢- بۆ ئەوکەسانەی کە زۆر داری دەکەن ، وە زۆر داریکی زۆر زالم و ستەمکارن ، هیچ بەزەیەکیان نیە بە ژێردەستەکانیان دا ستەمیان لی دەکەن مافیان پێشەل دەکەن حەقیان پی نادەن ئازارو ئەشکەنجەی جستەی و دەروونی خەلکی ژێر دەستی خۆیان دەدەن بە نارەواو بی هیچ تاوانێك کە کردبیان ..؟!

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت :(( يخرج عنق من النار يوم القيامه ، له عينان يبصر بهما ، وأذنان يسمع بهما ، ولسان ينطق به ، فيقول : إني وكلت بثلاثة : بكل جبار عنيد ، وبكل من ادعى مع الله إلها أخر ، والمصورين )). مسند احمد برقم (٨٤٣٠ ) .

واتە :مارێك لە ناو مالی جحیم دەردەچێت لە رۆژی قیامەتدا کە دوو چاوی هەیە وپێیان دە بینی و دوو گوێی هەیە و پێیان دەبیستێت ، وزمانیشی هەیە و قسەی پی دەکات و دەلێت : من بۆ سی جۆر کەس راسپێردراوم : هەموو زۆرداریکی سەرسەخت و هەموو ئەوانەی کە لە گەل خوادا هاواریان دە کرد بەخوایەکی تر و ، وە بە وینەکیشانیش ..؟!

١٣- ئەو کەسانەی فەرمان دەکەن بەچاکە کردن و نەهی دەکەن لە خراپە کردن ، بەلام بە خۆیان جی بەجی ناکەن ، وەك ئەوە ئەم رۆو هەندیك لە مامۆستایانی ئاینی هەندیك خەلکی بە ناو بانگ خواز هەندیکی تر بەناو پیاو ماقوول و هەندیکی تر بە ناو قسە زان خوینەوار ، کاتیك فەرمان دەکەن بە چاکە کردن ، کەچی بە خۆیان ئەنجامی نادەن ، وە نەهیش دەکەن لە خراپە کردن ، کە چی بە خۆیان پیشەوای خراپە کارین دەستی لەسەر هەلناگرن ، یان ئەوە تا لە ناو مینبەرکان و تۆرە کۆمەلایەتیە کاندا قسەی قەسەی زل و گەورە دەکەن کەچی لە چاوی خەلك بزر بوون دەست بە خراپەکاری دەکەن کەچی خۆیان بە چاکەکار دەزان بە ر بەخۆیان خرپە کاری بلاودەکەنەوە لەسەر زەوی وەکو سەرکردەدە دزەکان کاربەدەست دزەکان خوینی میلەت دەمژن خراپە کاری بلاو دەکەنەوە لە دزی جەردەی بەد رەوشتی کەچی ماموستایان نی ئاینی فزەیان لیوە نایەت قسەی حەق ناکەن ..؟!

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفروویت : (( يجاء برجل في النار فيها كطحن الحمار برحاه ،فيطيف به أهل النار فيقولون : أي فلان ، ألست كنت تأمر بالمعروف وتنهي عن المنكر ؟! فيقول : إني كنت امر بالمعروف ولا أفعله ، وأنهى عن المنكر وأفعله )). صحيح البخاري برقم ( برقم ٧٠٩٨ ).

واتە : پیاویك دەهینین و فریی دەدەنە ناو مالی جحیم یان ئاگری دۆزەخ ، بەردەوری ریخۆلەکانی خۆیدا سور دەخوات وکو گویدریژ بەدەوری میخەکەیدا یان سنگەکەیدا ، و ئەهلی ئاگر دەبینن و دەلین : ئەی فلان کەس ئەی تۆ فەرمانت بەچاکە پی نەدەکردین و نەهیت لیمان نەدەکرد لە خراپە ..؟! ئەویش دەلیت : من فەرمانم بە چاکە پی دەکردن و خۆم نەم دەکرد و نەهیم لیتان دەکرد لە خراپە و خۆمیش دەم کرد ..؟!

هەروەك ئەم دوو ئایەتەی سوورەتی البقر کە ( خوای گەورە ) دەفەرموو یت : ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ (١١) أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِنْ لَا يَشْعُرُونَ﴾البقر١١-١٢ . واتە : ئەوانە کاتیك پییان دەوتریت تۆوی گوناهوو تاوان و خرپەکاری مەچینن لەزەویدا ، دەلین : بەراستی ئیمە تەنها چاکسازی دەکەین ..؟!ئاگادار بن ،کە کە بە راستی هەر ئەوانە تۆوی خرپە دەچینن ..؟! بەلام بە هۆی لووت بەرزی و دەردە دارییاننەوە هەستی پی ناکەن و خۆیانی لی گیل دەکەن ..؟!

١٤-ئەو كەسەی ئازاری دایك وباوكی دەدات صیلەی رەحمی دە پرچنینیت لە نیوان خۆی دایك و باوك جا بە هەر هۆكاریك بیت ، چونكە ئەوانە دایك و باوكن دەبیت بۆ هەمیشەیی لە ژیر فەرمانیان دەر نەچیت و ئازاریان نەدەیت ،یان بە خراپە هەلسوكەوت لەگەلیاندا ئەوا خاوەنی ئەم سیفاتە دەچینە ناو مالی جحیم لە ئاگری دۆزەخ دا دەسووتیت ،چونكە دەبیت چاكە كار بیت لە گەل دایك و باوكت ،ئەگەر خراپەیان لەگەل دا بكەیت ،ئەوا مالی جحیم جیگاتە بۆ ماوەیەك تیدا دەسووتیت..!؟

هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا (٢٣) وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾الاسراء٢٣ -٢٤ . واتا: پەروەدگاری تۆ بریاریداوە كە جگە لەو كەس تر نەپەرستن هەروەها بریاریداوە چاكە كاریش بن لەگەل دایك و باوكتاندا ،هەر كاتیك یەكیكیان یان هەردوو كیان بە پیری كەوتنە لای تۆ ( تەنانەت )ئوفیان لەدەست مەكەو ( هەرگیز ) بەردەوامیش قسەو گفتو گۆت لەگەلیاندا با چاك و جوان و بەجی بیت ..!!

١٥- ئەوكەسەی كە سیلەی رەحم دەپرچینیت ، لەگەل خزمانی دا لەگەل موسلمانان دا هەر وەك ئە فەرموودەیە پیغەمبەری خوا (( صلى الله عليه وسلم ))دەفەرموویت : (( لايدخل الجنة قاطع )).

واتا: ئەو كەسیەی سیلەی رەحم بپچرینیت نا چیتە بەهەشتەوە ..!!

١٦- ئەوكەسەی بەرتیل وەردەگریت و بەرتیل دەدات ناچیتە بەهەشتەوە شوینی لە مالی جحیم و ئاگری دۆزەخە ، پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( الراشي والمرتشي فى النار )) . رواه التبرانى .

واتە : ئەو کەسەی بەرتیل وەردەگریت یان بەرتیل دەدات لە ناو مالی جحیم و ئاگری دۆزەخ دان ..!!

١٧- شایەتیدانی بەدرۆ ، ئەوکەسەی بۆ بەرژەوەندی خۆی یان بۆ پارە مال و سامان شایەتدی بەدرۆ بدات ئەوا دەچیتە ناو مالی جحیم یان ناو ئاگری دۆزەخ و هەروەك پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( لن تزول قدم شاهد الزور حتى يوجب الله له النار )) . رواه ابن ماجه .

واتە :لە رۆژی دواییدا دوو پیی ئەو کەسەی کە شاهیدی درۆی داوە نا جوولی هەتا خوا ئاگری لەسەر واجب دەکات یان دەیخاتە مالی جحیم ..!!

١٨- سویند خواردن بە درۆ بۆ ئەوەی شتی راست بشاریتەوە شتیکی باتل ناحەق بەکەی بەراست ئیجا سویندی درۆ بخۆی لەسەری بۆ ئەوەی باوەر بەخەلك بەهینی کەچی لەراستیدا دۆر بیت راست نەبیت ..!!

پیەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( من أقتطع مال أخيه بيمين فادرة فليتبوا معقده من النار ليبلغ شاهدكم غائبكم مرتين أو ثلاثا )). رواه احمد .

واتە :هەر کەسی سامانی برا موسلمانەکەی بە هۆکاری سویندی درۆ ببات ئەوا با خۆ لە مالی جحیم یان ئاگری دۆزەخ دیاری بکات و ببینتەوە ،با ئەوانەتان کە ئامادە ئەوانە تان ئاگادربکاتەوە کە ئامادەنین سی جار ئەمەی فەرموو ..!!

١٩- خەش وخیانەت کردن لەژێر دەستی خۆت و ئامۆژگاری نەکردنیان ، بەشێوەیەك مامەلەیان لە گەل دە کات کە لەبەرژەوەندی ئەوان دانیە واتە ژێر دەستەکانیان دەچەوسینەوە و مامەلەی خراپیان لەگەل دا دەکەن ، لە هەمان کاتیش دا غەش و خیانەتیان لەگەل دەکەن درۆیان لە گەل دە کەن بۆ بەرژەوەندی خۆیان..!! پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( ما من عبد يسترعيه الله على رعية يموت يوم يموت و هو غاش لرعيته إلا حرم الله عليه الجنة )). متفق عليه .

واتە : بەندەیەك نیە کە خوا بیکات بە کاردبەدەست بەسەر کەسانیددا و پاشان ئەو رۆژەی کە دەمریت ئەگەر غەش وخیانەتی کردبیت لەژێر دەستە کانی ئەوا خوای گەورە بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات ..!!

٢٠-بە کار هینان ی قاپ قاچاغ دەفر بەرداخ دۆلکە و ئەو شتانەی خواردن وخواردنەوەی پی دە خۆیت،بە هەمان شیوە ئەو شتانەی کە وە قاپ قاچاغ ودەفر دۆلکە و بەرداخ ئەوانە نابیت لە ئالتوون و یان زیرو زیو بن ،چونکە حەرام کراوە خواردنەوە خواردن تیدا بخریتەوە ،واتە قەدەغەکراوە لە شەریعەتی ئیسلام ..!!

پیغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( الذي يشرب في آنية الفضة إنما يجر جر فب بطنه نار جهنم . ( وفي رواية ) إن الذي ياكل اويشرب في آنية الذهب والفضة إنما يجرجر في بطنه نار جهنم )).

واتە :ئەو کەسەی لە قاپ و قاچغی زیودا دەخواتەوە ئەوە لە ئاگری دۆزەخدا بە ناو سیکدا دەهینری و دەبری ، لەریواریەتیکی تردا دەفەرموویت : ئەوەی لە قاپ و قاچاغی ئالتوون یان زیر دا دەخوات و دە خواتەوە لە ئاگری دۆزەخدا بە ناو سکیدا دەهینری و دەبری ..!!

## جۆرەکانی سزاو ئیش ئازاری جەستەیی و دەروونی ناو مالی حجیم :

### یەکەم : خواردنی مالی جحیم :

( خوای گەورە )دەفەرموویت : ﴿لَيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِنْ ضَرِيعٍ (٦) لَا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِنْ جُوعٍ﴾ الغاشيه ٦-٧ . واتا : هیچ خۆراکیشیان نیه تەنها لە درکی ووشك وتفت وتالە ( جۆرە رووەکیکی بیابانیە بە تەری تەنها وشتر دەیخوات ، و بە ووشکی ووشتریش نایخوات ..؟!

هەروەها( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ لَدَيْنَا أَنْكَالًا وَجَحِيمًا (١٢) وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا﴾ المزمل ١٢-١٣ . واتا : بەراستی ئیمەکۆت و زنجیرە دۆزەخمان ئامادە کردووە بۆ ئەو جۆرە تاوانبارانە ..!!هەروەها خۆراکیك قیزە ون ودرکاوی پیان دەدریت ، . کە گەروو دەگیریت ،سەرەرای سزای بە ئیش و ئازار ..؟!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ (٥١) لَآكِلُونَ مِنْ شَجَرٍ مِنْ زَقُّومٍ (٥٢) فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ (٥٤) فَشَارِبُونَ شُرْبَ الْهِيمِ (٥٥) هَذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ ﴾ الواقعه ٥١-٥٦ .

واتا: بی گومان ئیوە ئەی گومراو بی باوەران ئەی ئەوانەی کەبارەرتان بەراستیە کان نیە ..!!لە بەرهەمەکانی بەروبوومی درەختی زەقومیش دەخۆن یان درەختی زەقتەبووت ..!! ورگ و سکتان لی پردەکەن ..!!ئینجا ئاوی کولاو گەرمی بەسەر دادەکەن ..!!هەر وەك ئە ووشترانەی بە هۆی نەخۆشیەکی تاییەتەوە تیر ئاو نابن ..!! ئەمەیە میوانداری ئەوانەلە رۆژی حیساب دا یان رۆژی قیامەت دا ..!!

هەروەك پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( لو أن قطرة من الزقوم قطرت في دار الدنيا لأفسدت على أهل الدنيا معايشهم فكيف بمن يكون طعامه )).رواه ابن ماجه برقم ( ٣٠١ )

واتە: ئەگەر یەك دلۆپیك لە و درختەی زەقووم بیتە ناو ژیانی دونیاوە ئەوا ژیان و گوزەرانی هەموو خەلکی دونیا تیك دەدات ، جا چ جای ئەوەیە کە ئەمە خواردنی مالی جحیم بیت ..؟!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ (٦٢) إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِّلظَّالِمِينَ (٦٣) إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ (٦٤) طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ (٦٥) فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ (٦٦) ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ (٦٧) ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى الْجَحِيمِ﴾ **الصافات ٦٢-٦٨.**

**واتا: باشە ئایا ئەو بەهەشت و نازو نیعمەتە چاکە ..؟! یان درەختی زەقووم یان داری زقووم یان زەقنەبووت ..!! ئیمە کردوومانە بەهۆی ناخۆشی و ئازار بۆ ستەمکاران ئەوانەی لە دنیادا گالتەیان دەهات و دەیان ووت : چۆن لە ناو ئاگردا درەخت دەرویت ..؟! بی گومان ئەوە دەرختیکە لە ناخی مالی جحیم دایە و لەوی لق وپۆپەکانی بە هەموو بەشەکانی دۆزەخ دا بلاوکردۆتەوە ..!! بەروو بوومەکە یان بەرهەمەکانی وەك سەرکە کەلەی شەیتانە کانە لە ناشرینی و قیزەونی بی لەزەتی دا ..!! دۆزەخیە کان بە ناجاری لی دەخۆن و سکی لی پر دەکەن ..!! لەوەودوا خوانەوەیەکی یان شلەمەنیەکی زۆر گەرم بەسەری دادەکەن ،وە بەزۆری دەر خواردنیان دەدریت ..!! پاشان دوای ئەوەی کە تیریان خوارد تیریان خواردەوە ..!! بەدەم شەق و پیلەقە و وتیهەلدان و سەرزەنشتی فریشتەکانی دۆزەخەوە بەزۆر دەگیردینرەوە بۆ ناو دۆزەخ دیارە براون بۆ شوینی تایبەتی خواردن و خواردنەوە ..؟!**

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَلَيْسَ لَهُ الْيَوْمَ هَاهُنَا حَمِيمٌ (٣٥) وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ (٣٦) لَا يَأْكُلُهُ إِلَّا الْخَاطِئُونَ﴾ **الحاقه ٣٥-٣٧.**

**واتا: کەواتە ئەمرۆ ئا لیرە هیچ دلسۆزیکتان بۆ نیە..!! ، خۆارکیش تەنها لە کیم و خوین و زوخاو ی داچۆاو نەبیت هیچی تر نیە ..!!کە کەس نا یخوات جگە لە ستەمکاران و تاوانباران نەبیت ..!!**

## دووەم : خواردنەوەی مالی جحیم :

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿ مِنْ وَرَائِهِ جَهَنَّمُ وَيُسْقَى مِنْ مَاءٍ صَدِيدٍ (١٦) يَتَجَرَّعُهُ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُ وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ وَمِنْ وَرَائِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾ابراهيم ١٦-١٧ .

واتا : هەر یەك لە وانە لە دا هاتوو دا دۆزەخ چاوەرییەتی و تیایدا کیم زووخاوی درخواد دەدریت ..!!

جا ئەو کیم خوین و زووخاوە قوم قوم بە ناچاری دەخواتەوە و بە ئاسانی بۆ قوت نادریت ، مەرگیش لە هەموو لایەکەوە هیرشی بۆ دەهینیت کەچی ناشمریت ، لەوەو دواش سزاو ئازاری هەمە جۆر و ناخۆش و گران یەخەی بە رنادات ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿كَمَنْ هُوَ خَالِدٌ فِي النَّارِ وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ﴾ محمد ١٥ . واتا : ئایا ئەو کەسەی بۆ هەتا هەتایی لە ناو مالی جحیم دایە نە دەمرن ئاوی کولاو گەرم دە کریت بە گەروویاندا ، کە ریخۆلە کانیان پارچە پارچە و تۆی تۆی دەکات ..؟!

هەروەها ( خوای گەورە )دەفەرموویت : ﴿يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ (٢٠) وَلَهُمْ مَقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ﴾ الحج ٢٠-٢١ . واتا: ئەو ئاوە کولاو گەرمە هەرچی لە ناو سکی دا هەیە بە پیستەکانەوە دەیتوینیتەوە ..!! گۆرزیش لە ئاسن بۆ لیدان و بەتوندی ئامادە کراوە ..!!

هەروەها( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا وَإِنْ يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا﴾ الكهف ٢٩ .

واتا: بی گومان ئیمە دۆزەخمان ئامادە کردووە بۆ ستەمکاران و زالمان ، لە هەموو لایە کەوە دەورەیان دەدات ، وە بەدیواری بلیسە وە ئابلوقەی داون یان گەمارۆی داون ، خۆ ئەگەر هاوار بکەن لە ئیش ئازارو توینیەتی دا ، ئەوا ئاو دەدرین بە ئاویکی گەرمی پیس و بۆ گەن و بۆن ناخۆش کە وەکو خلتەی کانزایی تواوە وایە ، ئەوەندەش گەرمە دەم و چاویان هلدەکورزینیت وە دەبرژینیت ،ئای کە چەند خواردنەوەیەکی تال و ناخۆشە ، چەندە جیگەو ریگە یەکی پر لە ئازارە ..؟!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمِهَادُ (٥٦) هَذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ (٥٧) وَآَخَرُ مِنْ شَكْلِهِ أَزْوَاجٌ﴾ ص ٥٦-٥٨ .

واتا: دۆزەخ ،کە دەچنە ناوی ، کەواتە ئای چ شوێنکی ناسازو سەخت و دژوارو ناسۆرە ..!! ئەمە ، وە دبا هەر بچێژن و بخۆن لە ئاو خۆراکی زۆرگەرم کیم و زوخاو خویناوی داچۆڕاوی مالی جحیم ..؟!شتی تریش لە بابەتانە هەموو جۆر دەرخواردیان دەدریت ..؟!

هەروەك لە صحیحی مسلم دا هاتووە لە ( جابرە ) وە دەلێت : پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموويەتی : (( إن على الله عهدا لمن شرب المسكرات يسقيه طينة الخبال )). واتە : ( خوای گەورە ) پەیمانی داوە بۆ ئەو کەسانەی بادەی سەر خۆشکەر دەخۆنەوە قورپاوی گیلاتتیان پی نۆش دەکات ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) ( طينة الخبال ) چیە ؟ فەرمووی: (( عرق من أهل النار ، او عصارة اهل النار )). فەرمووی : ئارەق خواردنەوەی مالی جحیم یان گۆشراوی دۆزەخە وەك قوورا وایە زۆر ناخۆشە و زۆر بەئیش و ژانە زۆر بۆن ناخۆشە وەك کیم ئاداب و خوین وزوخا گەرمی دۆزەخ وایە ..؟!

هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا﴾الكهف ٢٩ . ئاویکی گەرمی پیس و بۆن ناخۆشە کە وەکو خلتەی کانزایی تواوە وایە ،ئەوەندەش گەرمە دەم وچاو یان هەلدە کورزینیت و دەیبرژێنیت دای دەچۆرینیت ،ئای چەند خواردنەوەی تال ناخۆشە ،جەند جیگەیە پر لە ئازارو ناخۆش و ناسۆزە ..!!

لە ( ابی سعید خدری ) یەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموويەتی : (( ( بماء كالمهل ) ( كعكر الزيت ،فأذا قرب وجهه سقطت فروة وجهه فيه )). رواه احمد والترمذي .

واتە : وەکو روونی تواوە و قرچاوە وایە ،ئەگەر لەدەم و چاوی نزیك بووەوە پێستی دەم و چاو بەر دەبیتەوە ناوی ..!!

## سی یەم : جل و بەرگی مالی جحیم :

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ (٤٩) سَرَابِيلُهُمْ مِنْ قَطِرَانٍ وَتَغْشَى وُجُوهَهُمُ النَّارُ (٥٠) لِيَجْزِيَ اللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾ابراهيم ٤٩-٥١ .

واتا : لەو رۆژەدا تاوانباران مجریمەکان و گوناهباران و ستەم کاران ،دە بینیت کۆت زنجیر کراوەتە دەست و پی و ملیان بەیەکەوە بەستراون ..!! کراس و جلەکانیان لە قەترانی رەشە کە مادە یەکی زۆر بۆن ناخۆشە و بەخێرایش دەسوتیت ،و بلیسە ئاگری رووخساریانی دا پۆشیوە زۆر لە سەغلە تیدان و زۆر لە ئیش و ئازار دان ..؟!بی گومان ئە تۆلە سەندنەوەیە لە زالم وستە مکارانە بۆ ئەوەی (خوای گەورە ) پاداشتی هەر کەسیك بەگویرەی کردەوە خرا پەکانی بداتەوە ، چونکە بەراستی (خوای گەورە ) بەخێرایی لیپرسینەوە کان ئە نجام دەدات ..؟!

هەروەها لە تفسیری (ابن کثر ) دا هاتووە : (سرابیل ) کۆی (سربال ) واتە (شەروال ) .

لە (أبو مالك الاشعری ) دەلیت : پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : (( أربع في أمتي من أمر الجاهلية لا يتركونهن : الفخر في الاحساب ، والطعن في الأنساب ، والاستسقاء بالنجوم والنياحة . وقال النائحة إذا لم تتب قبل موتها تقام يوم القيامة وعليها سربال من قطران ، ودرع من جرب )) رواه مسلم .

واتە : چوار جۆرە کەس هەن لە أمتی من لە سەر ئەو عادەتەی جاهلیان ترك نەکردووە : فخرو شانازی بە خۆیان دەکەن ،وە رخنە طعن لە نەسب دەدن ، گریان لەبەردەم ئەستیرە کان لۆرانەوە . ووتی : (نائحە ) ئەو ئافرەتانەی مردوو دەلاوینەوە پی دەلین (نائحە ) گەر تۆ بە نەکات پەشیمانی دەر نەبریت پیش مردنی ، ئەوا لە رۆژی دوایی زیندوو دەکرینەوە بە جۆریك جل بەرگی کی رەشی وە ك قەتران لەبەر دەکەن یان زری پۆشیکی لەمسی تواوەی لەبەر دەکەن یان درع لە مسی تواوەو لەبەر دەکەن ..؟!

( خوای گەورە )دەفەرموویت : ﴿هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِنْ نَارٍ يُصَبُّ مِنْ فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ﴾ الحج ١٩ .

واتا: ئەوانە دوو دەستەی دژ بەیەك ئیمانداران و بی باوەران کردیانە کیشە لەبارەی پەروەردگاریانەوە ( لە زات و سیفات و قەزاو قەدەری و ...هتد ) جا ئەوانەیان کە بی باوەرە بوون پارچە جل وبەرگیك یاب پارچە پۆشاك لە ئاگر براوە بەبالایان ، ئاوی زۆر کولاوی لەسەرویانەوە دەکریت بەسەریاندا لە دەر ئە نجامی سەرسەختی و یەرکەشییاندا ..؟!

هەروەها لە ( سمرە ی کوری الجندب ) دەلیت : پغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویە تی : (( منهم من تأخذ النار إلى ركبته ، ومنهم تأخذ النار إلى حنجرته ، ومنهم تأخذ النار إلى عنقه ومنهم تأخذ النار إلى ترقوته )) .رواه مسلم

واتە : لەو کەسانەی مالی جحیم ، کەسی وایەان تیدایە ئاگرە کە تا چۆکی هاتووە ، وە کەسی وا هەیە ئاگرەکە تا ناوکی هاتووە ، وە کەسی وا هەیە ئاگرەکە تا گەردنی هاتووە ، وە کەسی واش هەیە تا قور قوراگەی هاتووە ..!!

## چوارەم :راخەرو یان دۆشەك و لیفەی مالی جحیم :

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿لَهُمْ مِنْ جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِنْ فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾الاعراف ٤١ . واتا: ئەوانەی لە مالی جحیم دان ، رایەخی ئاگرینیان هەیە، لە سەروشیانەو ( سەقف و بەتانی لیفەی ئاگرین دا پۆشەریانە ( سەری و خواریان ئاگرە ) بی گومان هەر بە و شیوەیە پاداشتی ستەمکاران دەدەینەوە و تۆلەیان لی دەسینین ..؟!

هەروەها ( خوای گەورە )دەفەرموویت: ﴿لَهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِنَ النَّارِ وَمِنْ تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ﴾الزمر١٦. واتا: ئەو کەسانەی مالی جحیم لەسەرووەو پەلە ئاگرو دووکەل دەورەی داون ،بەهەمان شیوەی لە خوارەوەش پەلە ئاگرو دووکەل دەورەی داون ..؟!

## پینچەم : مارو دووپشکی مالی جحیم :

( خوای گەورە ) پەنامان بدات ، چونکە مالی جحیم لانە و جیگەیەکی زۆر سەخت و دژوارە و ناخۆش ناسۆزە ،نارەحەتیەکی زۆر سەختی تیدایە بۆ ئەو کەسانەی کە شونیان ناو مالی جحیمە بۆ ماوەیەك بیت یان ئەوە تا بۆ هەتاهەتای تیدا بمینەوە ..؟! جا سزاکانی جۆراو جۆرن نەچاو بینیویەتی نەگوییی بیستویەتی ، هەر بۆ یە بوونی مار و دووبشکی لە مالی جحیم دا هەیە بۆ ئەوکەسانەئامادە کراوە کە خرا پە دەکەن ستەم لە خەلکی بی دەسەهەلات و لاواز دەکەن .

هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ زِدْنَاهُمْ عَذَابًا فَوْقَ الْعَذَابِ بِمَا كَانُوا يُفْسِدُونَ﴾النحل ٨٨ .واتا : بی باوەران لەریگای راست و دروست لایاندا ، سەرەرای سزاکانی خۆیان سزامان بۆ زیاد کردوون ..؟! (ابن عباس ) لە تفسیری ئەم ئایەتە دەفەرمووی: ئەو سزایەی کە ( خوای گەورە ) بۆ بی باوەرانی زیاد کرد ئەوا مارو دوبشکە هیندەی هیستر دەبن ..؟!

هەروەك پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : ((ان في النار حيات كأمثال أعناق البخت المولفة تلسع اللسعة فيجداحرها سبعين خريفا ، وان في النار عقارب كأمثال البغال المولفة تلسع احداهن اللسعة فيجد أربعين سنة )). الباني تخريج مشكاة المصابيح ٥٦١٩ .

واتە : لە ناو مالی جحیم ماری وای تیدایە وەکو ملی ووشتر وایە ، بە هەر کەسیك وە بدات حەفتا پایز ، هەست بە ئیش وژانی زۆری پی دەگات ،دوو بشکی وای تیدایە بە هەر کەسیك وە بدات چل سال هەست بە ئیش و ئازارەکەی دەکات ..؟!

( ابن مسعود ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : دەربارەی ئەم ئایەتەی کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت:﴿زِدْنَاهُمْ عَذَابًا فَوْقَ الْعَذَابِ﴾النحل ٨٨ . واتە : ( زيدوا عقارب كالنخل الطول ) ، دووبشکی گەورەی وەهایان بۆ ئامادە و زیاد دەکریت کە کەلبەیان هیندەی دارخورمای دریژ دریژە وایە ..؟!

## شەشەم : ئەو رووبارەی مالی جحیم ( الغوطة ):

ئاویكی بۆگەنی زۆر ناخۆشە لەداوینی ئارەتانی داوین پیسەوە دەردەچیت ، ئەوەدەبیتە رووباریك لە ئەم ئاوە پیسە بۆگەنە بۆ ئەوانەی لە مالی جحیم یان لە دۆزەخ دان ،ئەم رووبارە بۆگەنە بە پیشیان دادەروات و بۆنكی هەتا بلی ناخۆش پیسە بۆ دۆزەخیە كان ئامادە دەكریت .

هەروەك پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( نهر يجري من فروج الومسات ، يؤدي اهل النار ريح فروجهم )) .رواه احمد .

واتە :رووباریكە لە داوینی ئافەرتی داوین پیسەوە سەرچاوە دەگریت ، بۆنی داوینیان ئازاری دۆزەخی یەكانی مالی جحیم دەدات ..؟!

هەروەها لە ( ابی موسی الاشعری )وە – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیه وسلم ) فەرموویەتی : (( ثلاثة لا يدخلون الجنة : مدمن الخمر ، وقاطع ارحم ،ومصدق بالسحر ، ومن مات مدمن الخمر سقاه الله من نهر الغوطة ، قيل : وما نهر الغوطة ..؟! قال : نهر يخرج من فروج المومسات ،يؤذي أهل النار ريح فروجهم )). صحيح الاسناد . المستدرك علي الصحيحين الحاكم (ت٤٠٥) واتە: ئە و سیفاتانە ناچیتە بەهەشتەوە : ئەوەی گیرۆدەی خواردنەوی شراب بیت ، یان ئەوەی صیلەی رەحم بچرینیت ، یان ئەوەی بە جادووگەور ساحیر باوەر بكات بچیتە لای ،هەر كەسیك لە كاتی خواردنەوەی شراب یان بەشەراب خواردنەوە مرد ،ئەوا رووباری الغوطة : بۆ ئامادە كراوە بۆ خواردنەوەی ،لەلایەن ( خوای گەورە ) ، هەروەها ووتی : الغوطة: چیە ئەویش فەرمووی : رووباریكە لەدامینی ئافرەتی داوین پیسەوە دیت بۆنكی زۆر ناخۆشی هەیە ..؟!

.

## حەوتەم :كۆت زنجیر بەستنەوەیان لە مالی جحیم :

بی گومان جۆریك لەئەشكەنجەكانی مالی جحیم بریتیە لە : كۆت زنجیر كردنیان ،ئەوش بەشیكە لە ئازاردانی دەروونی ئەوكەسانەی كە شوین و جیگایان بۆ خۆیان دیار كردووە لەمالی جحیم یان لەدۆزەخ دا ،بۆئەوە ئەكەسانەی كە سزای بەئیش ئازار دەدرین نەتوانن هیچ دەست پی یان بجوولینن ،وە ئازاریكی شە بۆ ریسوایی سەر شۆریان لە قیامەتدا ، كە لەژیانی دونیادا جۆن ئازای خەلكی بی تاوانیا داوە ئاوا بەلكو زیاتریش لەوە ئازار دەدرین كە هیچ كەس تصورە ناكات كەئازارو ئیشە كە چەند ناخۆشە ..؟!

هەرەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلَاسِلَ وَأَغْلَالًا وَسَعِيرًا﴾الانسان٤.

واتە: بەراستی با بزانیت كەئیمە چەندەها كۆت و زنجیرو ئاگری هەلگیرساومان ئامادە كردووە بۆ بی باوەران ..؟!هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ لَدَيْنَا أَنْكَالًا وَجَحِيمًا ﴾ المزمل ١٢ .

واتا: بەراستی ئیمە كۆت و زنجیرو مالی جحیم مان ئامادە كردووە بۆ ئەو جۆرە تاوانبارانە وستەمكارانە.

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت: ﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ (٢٥) وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ (٢٦) يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ (٢٧) مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيَهْ (٢٨) هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ (٢٩) خُذُوهُ فَغُلُّوهُ (٣٠) ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ (٣١) ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ﴾ الحاقە ٢٥-٣٢ .

واتا: بەلام ئەوەی نامەی كردەوەكانی دەدریت دەستی چە پیەوە ، ئەوە دەلیت : خۆزگە نامەی كردەوەكانم پی نەدەدرایە ..؟! هەر نەمزانیایە لیپرسینەوەم چۆن دەبیت ..؟!خۆزگە مردنەكەم یەكجاری بوایە ئاوا زیندوونەكرامایەتەوە ..؟! ئەوەتە، ئەومال و سامانەی كە هەبوو ،فریام نەكەت ،بەلكو نەماو تەفرو تونا بوو ..؟!ئەو سولتە و دەسەهەلاتەی كە هەبوو ،لەدەستمدا نەماو لەدەستم چوو بەفریام نەكەوت ..؟!

ئەوسا ئیتر فەرمان دەدریت ئادەی بیگرن و كۆت و زنجیر لەدەست و قاچ و ملی بئالینن ..!! لەدواوە بەروە مالی جحیم راپیچی بكەن وبیبەن وبیخەنە ناوی مالی جحیم ..؟! پاشان بە زنجیریكی حەفتا گەز بیبەستنەوە بە دینگە وعامودو ستوون یان پایە كانی ناو مالی جحیم ..؟!

## هەشتەم : گریان و نالە و فرمسکی مالی جحیم :

بی گومان ئەم هەموو سزاو ئازارو ئەشکە نجە ئازاری دەروونیان ،گریان نالە و هاواریان لی پەیدا دەبیت ،وە شین و واوەیلایان لی دەکەویتەوە ،چۆنکە ناخۆشی ئیش ئازارە کانیا لە ئیسقان و مووغ ومیشکیان کاردەکات ،هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُقَرَّنِينَ دَعَوْا هُنَالِكَ ثُبُورًا﴾ الفرقان ١٣ . واتا:هەر كاتیك ئەهلی مالی جحیم بە كۆت و زنجیرە و فری دەدرینە ناو شوینیکی تەنگە بەرەوە لە دۆزەخدا، داوای مەرگ و مردن و نیاچوون دەکەن و ە مردن بە ئاوات دە خوازن لەم شوینە دا ..؟!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿أَنْ تَقُولَ نَفْسٌ يَا حَسْرَتَا عَلَى مَا فَرَّطْتُ فِي جَنْبِ اللَّهِ وَإِنْ كُنْتُ لَمِنَ السَّاخِرِينَ﴾ الزمر ٥٦. واتا: نە وەکو یەکیك بلیت : ئاخ و داخ و پەشیمانی بۆ ئەو هەموو خراپە و لادانە و نادروستیانەی کە کردم لە ژیانی دونیا دا، لەفەرمان و بەرنامەی خودا لامدا ،لە کەسانەش بووم کە گالتەیان بە دین و ئاین و بەرنامەی خوا دەکرد و ئیماندارنم بە دواکەوتوو کۆنە پەرست دەزانی ..؟!

هەروەك پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) دەفەرموویت : (( ان اهل النار يكون حتى لو أجريت السفن في دموعهم لجرت وانهم ليبكون ، الدم يعني مكان الدمع )). رواه الحاكم في ترغيب والترهيب ج٤ص٤٩٣.

واتە:دۆزەخی یەکان ئەوەندە دەگرین نالە هاواریان دیت ،ئەگەر سفینە یان کەشتی لەفرمیسکیان بکەویتە ری ئەوە دەتوانیت براوات ، وە گریانەکەشیان خوینە لەجیاتی فرمیسك..؟!

بەلی بی گومان مالی جحیم لە دووری ( ٥٠٠ ) سال هاوارو نالەی ئەو کەسانەی لە دۆزخ دان یان لە مالی جحیم دا هاوارو نالەیان بەرزدەبیتەوە ، ئەوانەش کە بی باوران و هابەش بریاردەران ستەم کارو مونافیقەکان نەن هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ بَلْ كَذَّبُوا بِالسَّاعَةِ وَأَعْتَدْنَا لِمَنْ كَذَّبَ بِالسَّاعَةِ سَعِيرًا (١١) إِذَا رَأَتْهُمْ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا (١٢) وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُقَرَّنِينَ دَعَوْا هُنَالِكَ ثُبُورًا (١٣) لَا تَدْعُوا الْيَوْمَ ثُبُورًا وَاحِدًا وَادْعُوا ثُبُورًا كَثِيرًا﴾الفرقان ١١-١٤ . واتا : نەخیر رەخنەیان بەجی نیە ،ئەگینا ئەوان بروایان هەر بە رۆژی قیامەت نیە ، ئیمەش ئاگری بلیسە دارمان بۆ ئەو کەسانە ئامادەکردووە کەبروایان بە قیامەت نیە..!!کاتیك هەر لە دوورەوە ئەو ئاگرە بلیسەدارە خوانە ناسان دەبینیت دەنگی خەشم و قین و هەناسەی داخ لەدلی دەبیستن ..!! هەر کاتك ئەوانە بەکۆت و زنجیرەوە فری دەدرینە ناو شوینیکی تەنگەبەرەوە لەمالی جحیم دا ،دوای مەرگ و مردن تیاچوون دەکەن و مردن بە ئاوات دە خوازن لەوی .ئینجا پییان دەوتریت : ئەمرۆ داوای تەنها مردنیك مەکەن بەلکو دوای مردنی زۆر و بی ژمارە بکەن و ئاواتی بۆ بخوازن !!..

هەروەها پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( من كذب على متعمدا فاليتبوا بين عيني جهنم مقعدا ،قيل يا رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) ولها عينان ؟! قال اما سمعتم الله عزوجل يقول :﴿ إِذَا رَأَتْهُمْ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا﴾ يخرج من عنق من النار ، له عينان تبصران ،ولسان ينطق فيقول :وكلت لكل من جعل مع الله الها أخر ، فهو ابصربه من الطير بحب السمسم فليلتقطه )).وفي راوية : (( اني وكلت بثلاث : بكل جبار عنيد ،ومن دعا مع اللة الها اخر ،وبالمضورين )).سلسلة الاحاديث صحصحة الباني .

واتە : هەر کەسیك بە ئەنقەست درۆ بکات بەدەم منەوە واتە( فەرمووده هەلبەستیت ) باشوینی خۆی لە نیوان هەردوو چاوی دۆزەخ بکات ، ووترا : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەویش دوچاوی هەیە ؟! فەرمووی : ئە گویتان لی نەبوو ( خوای گەورە ) لە مانای ئەم ئایەتەدای چی دەلیت ؟! :﴿ إِذَا رَأَتْهُمْ مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا﴾ کاتیك دۆزەخ لە جیگای دوورەوە دۆزەخیەکان دەبینیت ،گوبیستی ئەو نەرەو هاوارو نالە نالی دەبن ، ملی ئە ئاگر دەردەچیت کە دووچاوی هەی دەبینیت و ،وە زمانی هەیەقسەی پی دەکات وە دەلیت : من کراومەتەو بە پرسیاری ئازاری ئەوکەسانەی هاوەل وشریك و هابەش بریار دادەنین بۆ خوای گەورە ، وە لەبالندە بۆ کونجی کە دەبینی و لەزەوی هەلی دەگریتەوە –

باشتریان دەبینیت ..لەریوایەتیکی تردا دەلیت :: من بر پرسارى ئازاردانى ئەم سى کۆمەلەم :هەموو ستەم کاریکی زۆردار کەللە رەق ،هەرکەس و هاوەل بۆ خوا پەیدا بکات ،یان وینەگران ..؟!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿يُبَصَّرُونَهُمْ يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ (١١) وَصَاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ (١٢) وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ (١٣) وَمَنْ فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنْجِيهِ﴾المعارج ١١-١٤ .ئەوانە پیشانى یەکتر دەدرین تاوانبارو گوناهکارو ستەمکار ئاوات دەخوازیت کە ئەگەر بکریت بۆ دەرباز بوونى خۆى لەسزاى ئەو رۆژە هەموو کورەکانى بکاتە قوربانى خۆى ..؟!

وە هاوسەرو براکەى ..؟! خزم عەشیرەتەکەى کەلەدونیادا پەنایان دەدا ..؟! بە هەر چى دانیشتوانى سەر زەوى هەیە ئەگەر بۆى بکریت بیکاتە قوربانى خۆى ، پاشان خوا رزگارى بکات ..؟!

بەلام مەحالە بەشیوەیە رزگاریان بیت ، بەلى ئەمە حال و نالەى هاوارى مالى جحیم و دۆزەخییەکانە ..؟!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت: ﴿إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَالِدُونَ (٧٤) لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ (٧٥) وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا هُمُ الظَّالِمِينَ (٧٦) وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُمْ مَاكِثُونَ﴾الزخرف ٧٤-٧٧ .

واتا: بەراستی تاوانباران وستەمکاران ،لە ناو ئازارو وسزاى مالى جحیم بەهەمیشەیى دەمینەوە ..؟!ئازارو سزا لەسەریان کەم ناکریتەوە ، لە کاتیکدا هەمووشیان تیایدا نائومید و بى هیوان ..؟!

جا وانەبیت ئیمە ستەمان لیکردبن بەلکو هەرخۆیان ستەم کار بوون ..؟!دۆزەخى یەکان هاوار دەکەن ، ئەى ( مالك ) سەرپەرشتیارى دۆزەخ : دەبا پەروەردگارت بمانکوژیت ، دەبا بمرین و کۆتایى بەم سەغلە تیەمان بیت ،لەوەلامدا دەلیت : بەراستی ئەوە جیتانە و تیایدا بۆ هەمیشە دەبیت بمینەوە ئا بەو شیوەیە قورئانى پیرۆز باسى بەختەوەرى و باسى بەدبەخت و خەسارە مەندان و ناپووختە کان دەخاتە بەر چاو ، ئەو سا دیتەوە بۆ دونیا و دەیەویت پیش ئەوەى ئەو رۆژە بەرپا ببیت خەلکى فریاى خۆیان بکەون ..؟!

## نۆیەم : گەورەیی لاشەو جستەی ناشرینی مالی جحیم :

لە (ابو هريره) وە دەلیت : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت : (( مابين منكبي الكافر مسيرة ثلاثة أيام الراكب مسرع )). رواه البخاري صفة الجنة.

واتا: نیوان هەردوو شانی بی باوەران بە ئەندازەی سی رۆژ رییە بەسواری وولاخیك کەبەخیرایی براوات .؟!

هەروەها پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت : ((ضرس الكافر أي ناب الكافر مثل أحد ولظ جلده مسيرة ثلاث )). والمسلم صفة الجنة. واتە : ددانی پیشەوەی بی باوەر – واتە کلبەی – بەوینەی کیوییان چیای ئوحودە ، وە ئەستوورایی پیستە کەشی سی رۆژە رییە ..؟!

لەریوایەتیکی تر دا هاتووە پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت : (( ان الرجل من اهل النار لبعظم للنار ،حتى يكون الضرس من اضراسه كأحد )).رواه احمد و هو مرفوع .

واتە : ئادەمیزاد لە دۆزەخ دا بۆ ئاگر گەورە دەکریت ، هەتا یەکیك لە خری کانی دەبیتە ئەندازەی کیوی ئوحود ..؟!

هەروەها پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت : ((شفاعتي اكثر من مضر وان من يعظم للنار حتى يكوم احد زوايا ها )). رواه ابن ماجة .

واتە :هەندی لە ئوومەتە کەم بەشەفاعەتی من دەچنە بەهەشتەوە کەژمارەیان لە تیرەی (مضر) زۆر ترە ، وەهەندی لە ئوومە تەکەم دەچنە دۆزەخەوە تاکو ئەوەندی گۆشەیەی دۆزەخ گەورە دەکرین ..؟!

## دەیەم : ریخۆڵەی یان ریخەڵۆکی ئەوکەسەی لەماڵی جحیم دایە :

لە (اوسامەی كوری زیدە )وە – خوا لی رازی بیت – دەڵیت پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : (( یجاء بالرجل یوم القیامة فیلقی في النار ،فتندلق اقطاب في النار فیطحن فیها كطحن الحمار برجاء ، فیجتمع اهل النار علیه ، فیقولون : اي فلان ما شانك ..؟! الیس كنت تامرنا بالمعروف وتنهانا عن المنكر ..؟! قالأمركم بالمعروف وانهاكم عن المنكر واتیة ،ثم هو یدور ویسعی حولها كما یدور الحمار برحاء )).رواه المسلم .

واتە :لە رۆژی دوای دا پیاویك دینن وە فری دەدەنە نا ئاگری دۆزەخەوە ، جا ریخۆڵە كانی دەكەویتە نا ئاگرەكەوە و ژیر پی دەكەون ،ئینجا وەك گویدریژ ،یان وەك گا بەدەوری خۆیدا دە سووریتەوە یان دەخولیتەوە ، دۆزەخیەكان لی كۆدەبنەوە و پی دەڵین : ئەی فلانە كەس ئە تۆ چی دە كەیت لیر بۆچی وات لی قەوماوە ..؟! ئەی تۆ نەبوویت كە فەرمانت پی دەكردنی بە چاكە ..؟! وە ریگریت لی دە كردین لە خراپە ..؟! ئەوەیش لەوەلامدا دەڵیت : با وابووم بەڵام فەرمانم پی دە كردن خۆم نەم دەكرد ..!! وەریگریم دەكردن لە خراپە خۆ خراپە ئە نجام ادادا ..!! پاشان وەك گویدریژ یان وەك گا بەدەوری ریخۆڵەكانی دەسوریتەووە یان دەخۆڵیتەوە ، تەكان دەدات ..!!

بەڵی ئەوانەی لەماڵی جحیم كە بەریخۆڵە رادەكیشرین وەك (عمری كوری عامر ) ئەو بوو كە یەكەم كەس بوو ئائنی عەرەبی گۆری بۆ بت پەرستی وەك لەم فەرموودەیە دا هاتووە پیغەمبەر(صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( رأیت عمر بن عامر الخزاعي یجر قصبة في النار ،وكان اول منساب السوائب )) .رواە مسلم.

واتە : عمري كوري عامري خوزاعیم بینی كەبەریخۆڵە كانی بەناو دۆزەخدا رادەكیشرا یەكەم كەسیش بوو یاسا- سوائب – دانا ...!!!

## یانزەم :بێ هیوایی وپەشیمان بوونەوەی مرۆڤە کان لە مالی جحیم :

هەروەك( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا (٢٧) يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا﴾الفرقان ٢٧-٢٨.

واتا:رۆژێك دێت ستەمكاران پەنچەی خۆیان دەگەزن لە پەشیمانی دا دەڵێن : خۆزگە لە گەل پێغەمبەر دا ڕێبازی ئیمانم بگرتایە ..؟! هەروەها دە ڵێن : مردن یان مەرگ بۆ خۆم خۆزگە فلان كەسم نەكردایەتە هاوەل و دۆستی خۆم چونكە سەری لێشێواندم ..؟!

لە( محمدی كوری كەعبی )—خوالی رازی بیت - دە لیت : ئە هلی دۆزەخ هاوارو نالە دەبنە لای خزێنەكانی دۆزەخ یان سەرپەرشتیارانی دۆزەخ ..؟! هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَقَالَ الَّذِينَ فِي النَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ادْعُوا رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِنَ الْعَذَابِ﴾غافر ٤٩ . واتا: ئەوانەی لە ناو ئاگری دۆزەخ دان بەفریشتەی سەرپەریشتیار دەڵێن :دوا لە پەروەردگار تان بكەن ، تەنها رۆژێك سزاو ئازارمان لەسەر كەم بكاتەوە ..؟!

ئەوانیش لە وەلامدا دەڵێن : كە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿قَالُوا أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُمْ بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا بَلَى قَالُوا فَادْعُوا وَمَا دُعَاءُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ﴾غافر ٥٠ .

واتا: ئایا ..؟!مەگەر پێغەمبەرانتان بە بەلگەو نیشانە ی روون و ئاشكراوە ،رەوانە نەكرابوون بۆ تان ؟! هەمووان بە یەكدەنگ دەڵێن: بەلی . راستە ، ئینجا فریشتە كان دەڵێن : دەی كەوابوو هەر دوابكەن وبپارینەوە ، بێ گومان داخوازی وپارانەوەی كافران بەهیچ ناچێت تازە هیچ نرخیكی نیە و گیرا نابێت .؟!

جا دوای ئەوەی لە ( خزینەكان ) یان لە سەرپەریشتیارانی دۆزەخ بێ هیوا دەبن ، هاوار بۆ ( مالك ) دەبەن كە سەرۆكی سەر پەریشتیارانی دۆزەخە ،ئینجا دەڵێن : بە ( مالك ) ﴿وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُمْ مَاكِثُونَ﴾الزخرف ٧٧.واتا: دۆزەخیەكان هاوار دەكەن ئەی مالك كە فریشتەی سەرپەرشتیارە ، دەبا پەروەردگارت بمان كوژێت ، دە با بمرین و كۆتایی بەم سەغلە تیە مان بێت ، لە وەلامدا دەڵێت : بەراستی ئەوە جێتانە وتیایدا بۆ هەمیشە دەبێت بمیننەوە ئا بەو شێوەیەقورئان باسی

بەختەوەران و باسی بەدبەخت و ناپوختە کان دەخاتە بەرچاو ،ئەوسا دیتەوە بۆ دونیا و دەیەویت پیش ئەوەی ئەو رۆژە بەرپا ببیت خەلکی فریای خۆیان بکەون ..؟!

بەلی (مالك) سەرۆکی فریشتەکان بۆ ماوەیەك وەلامیان ناداتەوە ..!! ماوەی (٨٠) سال کە هەر سالیکی (٣٦٠) رۆژە ، وە هەر مانگیگی (٣٠) رۆژە ، وە هەر رۆژیکی ناو مالی جحیم یان دۆزەخ بە (١٠٠٠) سالی ژیانی دونیا هەیە ..؟! بەلی ئینجا (مالك) پاش (٨٠) سال وەلامیان دەداتەوە ، هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموویت: ﴿قَالَ إِنَّكُمْ مَاكِثُونَ﴾الزخرف ٧٧ .واتا بۆ هەمیشە تیدا بمیننەوە ..؟!

هەروەها لەریوایەتیك دا هاتووو کە (ترمزی) (اعمش) گیراویانەتەوە : دەگیرانەوە دەلین : لە نیوان دواکاریەکەی دۆزەخیەکان وەلامدانەوەی (مالك) بۆ یان بە فەرمانی (خوای گەورە) (١٠٠) سالی پی چووە..؟!

ئینجا دۆزەخیەکان دەلین : کە (خوای گەورە) دەفەرموویت : ﴿وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾الملك ٩ . واتا: ئەگەر ئیمە گویمان بگرتایە و بیرو هۆشمان بەکار بهینایە نەدەبووینە نیشتەجی دۆزەخ ..؟!

ئینجا دۆزەخیەکان دەلین : کە (خوای گەورە) دەفەرموویت : ﴿قَالُوا رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ فَاعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَى خُرُوجٍ مِنْ سَبِيلٍ﴾غافر ١١ واتا : دۆزەخیەکان لەوەلامدا دەلین: پەروەردگارا تۆ دەست لاتت بی سنوورە دووجار ئیمەت مراندووە و دووجار ئیمەت زیندوو کردۆتەوە . (مەبەست نەبوونی پیش هاتنە دونیا ، کە جۆرە مردنیکە و ئەو مردنەش کە دەیزانن ،ژیانی دونیا و زیندوو بوونەوەی قیامەتیش دوو جۆرە ژیانە ) ئایا چارەسەریك وریبازیك نیە بۆ رزگاریمان ..؟!

بی گومان وەلامیکی توند دەدەرینەوە (خوای گەورە) دەفەرموویت : ﴿قَالَ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ﴾المومنون ١٠٨ . واتا : (خوای گەورە) لەوەلامدا بەتوورەیەوە دەفەرموویت : بی دەنگ بن دەمتان داخەن ،قسە شم لە گەلدا مەکەن ..؟! ووشەی (اخسئوا) لەزمانی عربی دا بۆ (سەگ) بەکاردیت ..؟!

## دووانزەم : سیبەری مالی جحیم:

بی گومان بەهیزی ئاگری مالی جحیم لە توانای خۆراگری جستەی مرۆڤەکان نیە ، بەلام دەشیت ( خوای گەورە لەو رۆژە دا مرۆڤ بەشیوەیەك دروست بکاتەوە کە شیاوی ئەو سزا پر لەئیش و ژانە و ناخۆشە و سەختە ببیت هەر تەنها ئاوی کولاو گەرمی ئاوە کە بەسە بۆ ئەوەی سزای ستەمکاران پی بدریت جا چ ناخۆشیە کانی تری ، یان ئەو هەموو دول و کیوە ئاگرە یان ئە هەموو مار دووپشك سزا ناخۆشەی کە هەیەتی ..؟! هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ (٤٢) وَظِلٍّ مِنْ يَحْمُومٍ (٤٣) لَا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ (٤٤) إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُتْرَفِينَ﴾الواقعە ٤٢-٤٥.

واتا:لەناو گرە ئاوی لەکول دا گیریان خواردووەو دەتلینەوە دەتوینەوە دەقلینەوە ..؟! رادەکە بۆ ژیر سیبەرەکەی ، کە ئەویش دووکەلی رەش و گەرم و سوتینەرە ..؟! نەهیچ فینکە نە هیچ بە کەلکی حەوانەوە دیت ،چونکە بەراستی ئەوانەکاتی خۆی لەناو نازو نیعمەتی حەرامدا دەقنینەوە ..؟!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿انْطَلِقُوا إِلَى ظِلٍّ ذِي ثَلَاثِ شُعَبٍ (٣٠) لَا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِي مِنَ اللَّهَبِ (٣١) إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ (٣٢) كَأَنَّهُ جِمَالَةٌ صُفْرٌ (٣٣) وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ﴾المرسلات ٣٠-٣٤ .

واتا: راکەن دەرچن بۆ سیبەری ئەو دووکەلە کە سی برگەیە ..!! نەسیبەر تا لە سایەی بحەوینەوە ، نە لە بلیسەی ئاگری دۆزەخ دەتانپاریزیت ..!!بەراستی ئەو ئاگرە بلیسە یەك فری دەدات وەك کۆشك و تەلاریکی گەورە و ، مەزنە ..؟!هەر وەکو ووشتری زەردی مەیلە و رەش دەنوینیت ..؟! هاوار و ئاهو نالە لەو رۆژەدا بۆ ئەوانەی کە بروایان بە پیغەمبەران وقیامەت ولیپرسینەوە نەبوو ..؟!

## سیانزەم :ڕەشە هەڵگەڕانی دەم چاو قرچاندنی پیست مالی جحیم :

لە (ئەنسی کوری مالك )وە –خوا لی  رازی بیت – دەگێریتەوە : پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : (( لە قیامەت دا دۆزەخیەك دین کە خۆشترین ژیانی دونیا یان هەبووە ، ئینجا یەکجار دە کریت بە ناو مالی جحیم دا  پاشان پی دە ووتریت : لە دونیادا هیچ خیرو خۆشی یەکت بینیوە ..؟! ئەویش لە وەلامدا دەلیت : نە بە خوا هیچم  نەبینیوە ..؟!

هەروەها  پیغەمبەری خوا (صلی الله علیەوسلم ) دەفەرموویت : ((ان أهون أهل النار عذابا رجل اخمص قدمیه جمرتان یغلي منهما دماغه )).رواه البخاري ج١١ص٤١٧ . واته: ئاسانترین سووکترین سزاو ئیش ژانی دۆزەخیەك دینن پیاویکە ، دوو پۆلی یان دووپشکۆ ئاگر لەژیر هەردوو پی دا دادەنریت و میشکی دینیتە کولان برژاندن ..؟!

هەروەها (خوای گەورە )دەدەفەرموویت : ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾النساء  ٥٦.واتا: بەراستی ئەوانەی باوەریان نەهیناوە بە ئایەت وفەرمانەکانی ئیمە لە ئایندەدا دەیانسوتینین بە ئاگری دۆزەخ ،هەموو جاریك پیستیان داوەشاو سووتاو هەلقرچا ، پیستی تر دەکەین بە بەریاندا  بۆئەوەی بەچاکی سزاو ئازارو بچیژن ، بەراستی خوا هەمیشە و بەردەوام بالادەستە و دەتوانیت تۆلە لە خوانەناسان بسەنیت ، دانایە کە مۆلەتیان دەدات بەلکو بگەرینەوە بۆ ریبازی دینداری ..؟!

هەروەها(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ ابْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِي رَحْمَةِ اللَّهِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ال عمران ١٠٦  واتا: رۆژیك دیت رووخسارانیك سپی دەبن و رووخسارانیك رەش هەلدەگەرین ،جا ئەوانەی کە رووخساریان رەش هەلگەراوە پییان دەوتریت : باشە ، ئەوە ئیوە پاش ئیمانداری ، پەشیمان بوونەوە و ریبازی کوفرتان گرتە بەر..؟! دە بچیژن سزاو ئازار بەهۆی کافر بوونتانەوە ..؟!

## چواردەم : زۆرینەی خەلکی مالی جحیم یان دۆزەخە :

هەروەك ئەم فەرموودەیە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( ان اشد الناس عذابا یوم القیامةرجل قتل نبیا وقتله نبي ... )) واتە: سەخترین ساز بۆ کەسیك کە پیغەمبەریك بکوژیت یان بیغەمبەریك بیکوژیت ..؟! هەروەها پیغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) دە فەرموویت : (( اشد الناس عذابا یوم القیامة اشدهم عذابا للناس في الدنیا )).واتە : توندترین وسەخترین سزا لە رۆژی قیامەت دا بۆ کەسکیك کە توند ترین سزای خەلکی دەدات لەدونیادا . دەبا بە ناو مافی مرۆڤەکانیان جەلادو دیمکراسیەتی علمانیەت ئەوانەی کە دژایەتی ئیسلام بانگ خوازانی ئیسلام دەکەن با لەرۆژی قیامەت دا وەلامی ئەم تاوانەیان و ئەم خەلکە بدەنەوە کەبەرانبەریان ستەمیان لی کردبوون ..؟!

بەلی زۆرینەی خەلکی دۆزەخ یان مالی جحیم لە ئافرەتانە ، هەروەك ئەم فەرموودەیە : (( رأیت النار أکثر اهلها النساء )) .واتە :دۆزەخ م دیت ودیتم زۆربەی دۆزەخیەکان ئافرتن . هەروەها فەرمووی: ((وقمت علی باب النار ، فإذا عامة من دخلها النساء )). في صحیحین حدیث اسامة بن زید.

بەلی مرۆڤی نەزان و جهل لە شەرعی خوا وبەرنامەکەی زوو خۆ لەبیر دەکات سەرپیچی فەرمانەکانی خوا دەکات و دژایەتی بەرنامەکەی دەکات کە قورئانی پیرۆزە ، ئەم هۆکارە ی نەزانین ئنکاری کردنی بەرنامەکەی( خوای گەورە ) بۆ تە هۆی ئەوەی زۆرینەی خەلك لە مالی جحیم یان لە دۆزەخ دا بن یان ئەوا تا بۆ هەمیشەیی لەویدا بمینەوە یان ئەوە تا بەر رەحمەتی پەروەردگار بکەون رزگاریان بیت لەم مالە دا ،بەلام بەشیوەیەکی گشتی زۆرینەخەلك بەهۆی گوناهو تاوانەکان ستەمکردنیان لەدۆزەخ دان ..؟!

هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنْكَ وَمِمَّنْ تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ص٨٥.

واتا: سویند بەرزاتی خۆم دەبیت دۆزەخ پربکەم لە تۆ و لە هەموو ئەوانەی کەشوینی تۆ دەکەن ..؟!

هەروەها پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( عرضت علی الامم فرأیت نبي معه الرهیط ، .والنبي ومعه رجل ورجلان ،ولنبي ولیس معه احد ... )). واتە: لە قیامەت دا ئوممتانیان نیشان دام پیغەمبەری وەها هەیە کۆمەلکی لەگەلدایە ، پیغەمبەریك پیاویك یان دووپیاوی لە گەلدا بوو ، پیغەمبەریك کەس بروای پی نەهینا بوو ..؟!

هەروەها لە فەرموودەیەکی پیغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) دا هاتووە کە لە هەزار کەس دا ( ٩٩٩ ) کەس دەچیتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ،ئەوانیش زۆر بەیان لە قەرموی یاجووج و ماجووج ئەهلی کافر هاوبەش بریادەرانن ،هەروەها بۆ ماوەی ( ٥٠٠٠٠ ) هەزال سال رادەوەستن لە گۆرەپانی محشر دا ، زۆر بیزار نارەحەتە هیلاکو ماندوون ، بە جۆریك هەموو خەلك دەچنە خزمەتی یەك بەیەك پیغەمبەران ، بۆ شەفاعەت وەرگرتن و دەست پی کردنی کتاب و موحاسەبە و حیساب ، بەلام پیغەمبەران کەسیان ناتوانن ، بەدەم بانگەوازی خەلکی دا برۆن ، ئالەم رۆژە دا ترس ناخۆشی گەرمای زۆری رۆژی محشر ئارەقەکانیان دەگاتە قورگریان لەناو ئارەقەی لەشی خۆیان خەریکە نوقم دەبن ، ئا لەم رۆژە دا ( خوای گەورە ) فەرمان دەدات بە پیغەمبەران ..؟! بۆ دەرهینانی خەلکی دۆزەخیەکان ، ئالەم کاتەدا ئادەم پیغەمبەر دەفەرموویت : (( وما بعث النار )) واتە دۆزەخیەکان کین ..؟! ( خوای گەورەش دەفەرموویت : (( من كل الف تسعمائه وتسعة وتسعين )). لە هەزار کەس ( ٩٩٩ ) کەس بۆ ناو مالی جحیم یان بۆ ناو ئاگر ..؟! ئالە م رۆژە پر مەترسیە دا خەلکی هیچ کەس ئاگایی لە کەس نیە غەمگین و خەم ناکن نەهامەتیەکی گەورە روویان تیدەکات ،ئا ئەوە تا مندال لە ترسان سەری سپی دەبیت ،ئافرە تی سگ دار مندالی دەبیت ، کاتیك پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە نیو هاوەلانی دا ئەم فەرموودەیەی بۆ گیرانەوە خەلکی زۆر ترسان ،ووتیان : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) کامە لە ئیمە رزگارمان دەبیت ..؟! پیغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( ابشروا فان من ياجوج وماجوج الف ومنكم رجل )). واتە : مژدەی پیدان : کە هەزار کەس لە یاجوج ماجووج یەکەس لە ئیوە ئەهلی دۆزەخە ..؟! پاشان فەرمووی : خوازیارم سی یەکی بەهەشت ئیوە بن ..؟! هەروەها فەرمووی : (( والذي نفسي بيده اني لاطمع ان تكونوا شطر اهل الجنة ، ان مثلكم في الامم كمثل الشعرة البيضاء في جلد ثور الاسود ... )). واتە : سویند بەوەی نفسی منی بەدەستە خوازیارم نیوەی ئەهلی بەهەشت ئیوە بن وە وینەی ئیوە لە ناو ئوممەتاندا وەك موویەکی سپی یە لە ناو گایەکی رەش دا ..؟! هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ (١) يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ﴾الحج ١-٢ .واتە : ئەی خەلکینە لە پەروەدگارتان بترسن و خۆتان لەخەشمی بپاریزن چونکە بەراستی زەوی لەرزەی قیامەت و کاول بوونی بوونەوەر کارەساتیکی زۆر گەورەیە و رووداویکی سامناکە ..؟!لەو رۆژە کە کارەساتەکە دەبینن ، هەموو شیردەریك

لەشیر خۆرەکەی بیئاگا دەبیت و فەرامۆشی دەکات ، هەموو سگ پرو دووگیانیکیش منداله کەی دادەنیت ،خەلکی دەبینیت وەکو سەخۆشن ، لەراستیدا سەرخۆشیش نین ، بەلکو سزای خوایە زۆر سەخت و سامناکە وسەرس لی شیواندوون ..؟!

## پانزەم : ئەوانەی جگە لە خوا شتی تریان دەپەرست یان شخص پەرست بوون بە خۆیان و پەرستراوەکانیان بۆ مالی جحیم را پیچ دە کرین :

بی گومان سەرەرای ناردنی پیغەمبەران و بەرنامەو پەیامی پیغەمبەران کتابە کانیان وەك قورئان و تەورات و ئینجیل زبورو مصحفی ابراهیم ، بەرنامەکەی خوای گەورە کە پی راگەیاندوون لەریگەی پیغەمبەرانەوە ، کەچی مرۆڤ هیشتان گومراو سەر لیشیواو بووە هەر خەریکی هابەش دانان وشیریك بریادانان و کوفر بووە ،لە جیاتی ( خوای گەورە ) شتی بی سوود بی مانە و پرو پووچ دەپەرستن وە وەك پیاو چاك و شخچ پەرستی دار بەرد پەرۆ ، ئەو شتانە نەهیچ سوودیان هەیە نەهیچ زر یان هەیە ،لە جیگای خواپەرستی راستە قینە ، ئەم شتانە دەپەرستن ،جا ئەوەی پەنا بە وشتانە بگریت جگە لە خوا ئەوا ستەمیکی زۆر گەورە کردووە لە گەلە خۆیدا ،یان شخص پەرستی بکات و یان شتی تر بپەرستیك وەك مال سامان پارەو سەیارە و کەسی فەرمانراوە ، ئەوا هەر هەموویان بۆ نا ئاگری دۆزەخن ، ئەوەی ئەوان دەپەرستیت و وە پەرستراوەکانیش بەهەمان شیوە را پیچ دەکرین بۆ نا ئاگری دۆزەخ لە گەلیاندا ..؟!

بەلی ئەوانەی کە جگە لە خوا کەسی تر و شتی تر دەپەرستن ، زۆر بی میشك و زۆر نەزان و جاهل کەم عەقل و نەفامن ، هەست بە خوا یە ناکەن کە بەدیهینەری ئاسمانە کان زەویە بەدیهینەری هەمووشتیکە ، خاوەنی جیهانیانە ، بەلی ئینجا ئەو کەسانەی نەزان بوون کافرو موشریك بوون ،جگە لە خوا کەسانی تریان دەپەرست و یان ششخص پەرست بوون ، یان ئەواتا ئەوانەیان دەپەرست وە ك ( شخص پەرستی ، گا پەرستی و رۆژ پەرستی ،صلیب یان خاچ پەرستی ،یان ئاگر پەرستی ...هیتد ) بەلام هەندیکی تریش خوا دەپەرستن بەلام لە گەل خوا شتی تر دەپەرستن هاوبەش بۆ خودا دادەنین ، ئەوانەش شوینیان ناو مالی جحیم و ناو دۆزەخە ..؟! هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنْتُمْ لَهَا وَارِدُونَ (٩٨) لَوْ كَانَ هَؤُلَاءِ آلِهَةً مَا وَرَدُوهَا وَكُلٌّ فِيهَا خَالِدُونَ﴾الانبياء ٩٨-٩٩ .واتا: پاشان پییان دەووتریت : ئیوە و ئەو شتانەی لەحیاتی خوا دەتانپەرست سووتەمنی دۆزەخن وسلکە بزوتی ئاگرن ،دەبیت هەربچنە ناوی و هەمیشە

تییدان..!!هەروەها به هاوەڵگەران دەوترێت :ئەوانەی ئێوە دەتانپەرست ئەگەر خوا بوونایە ئاوا نەدخرانە نا و مالی جحیمیان ئاگری دۆزخەوە ،بی گومان هەر هەموویان هەوالگەران وپەرستراوە کانیان لە دۆزخدا بۆ هەمیشەیی دەمینەوە ..؟!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ (٢٢) مِنْ دُونِ اللَّهِ فَاهْدُوهُمْ إِلَى صِرَاطِ الْجَحِيمِ (٢٣) وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ (٢٤) مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ (٢٥) بَلْ هُمُ الْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ﴾ الصافات ٢١-٢٦ .

( خوای گەورە ) فەرمان دەکات بەفریشتەکانی هەموو ئەوانەی ستەمیان کردووە کۆیان بکەنەوە ، خۆیان و هاوسەرانیان ، خۆیان هاوشیوەیان و ئه شتانەش کە دەیانپرست لە دونیاد جگە لە خوای گەورە ..؟! ئەو شتانەی لەجیاتی خوا دەیانپەرست ،ئینجا رینماییان بکە بۆ ریگەی مالی جحیم یان دۆزەخ ،چونکە بی باوەڕو تاوانبارو ستەمکار بوون ..؟! لە کاتی را پیچ کردنیاندا فەرمان دەدریت : ئادەی بیانوەستینن ،بی گومان ئەوان پرسیار لیکراون ..؟!یەکیکیان مۆلەت دەخوازیت و دەلیت : من بەراستی کاتی خۆی لە دونیادا هاوەلیکم هەبوو ..؟! نەخیر . تازە کار لەکار ترازاوە ئەمرۆ هەموویان تسلیم وبی دەسەلاتن ..؟!

جا بۆ ئەوەی سەرزەنشتیان بکەن بی ریزیان پی بکەن ریسواور سەر شۆریان بکەن ،ئەوانەی ( رۆژ و مانگ ) یان دەپەرست ، لەرۆژی قیامەت دا رۆژو مانگ کۆدەکرینەوە دەخرینە ناو دۆزەخەوە لە پیش چاوی ئەوانەی کە لەدونیا دا ئەیان پەرست ، هەروەك پیغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( الشمس والقمر مکوران فی النار )) . سلسلة الاحاديث الصحيحة . واتە : رۆژو مانگ کۆدەکرینەوە ناو ئاگری دۆزەخەوە ..؟!

بەلی هەندی لە زانایانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام رایان وایە کە کۆکردنەوەی ( رۆژو مانگ ) بۆ ناو ئاگری دۆزەخ تەنها بۆ چاو شکاندنی ئەو بت پەرست هاوبەش بریاردەرانەیە کە چاویان بشکیت ئەوشتانە بی گیان هیچ سوود قازانج بە مرۆڤ ناگەیەنن ،یان ئەوانەی شخص پەرستیان دەکەن لەدونیا دا ،ئەوەی حەزی لی بیت کە بپەرستریت بەئەندازەی گەردیلەیەك ئەوا دەچیتە ناو ئاگری دۆزەخەوە لە گەل ئەوانەی کە دەیان پەرست ، جا گەورە ترین ستەم و تاوانە چ لەوە گەورە تر نیە جگە لە خوا خوایەکی تر بپەرستیت یان لە گەل خوا خوایەکی تریش بپەرستیت یان ئەوە تا هاوبەش بریار بدە بۆ خوا ، بی گومان تاوانیکی یەکجار گەورەیە لی خۆش بوونی ئەستەمە ،هەر بۆیە سزایەکی زۆر گەورە بۆ ی ئامادە کراوە ..؟!

## ئەو هۆكارانەی رزگامان دەكات لە مالی جحیم :

### یەكەم : ( یە ك خوا پەرستی ) ( التوحید )

كە ( خوای گەورە ) بە تەنها بپەرستیت بەتە نها عبادە ت بۆ ئەو زاتە بكەیت وە هیچ خوایەكی تر نەكەیت بە هاوبەش و شریك بەتە نها ئەو زاتە بپەرستیت ، واتە : یەكخوا پەرستی راستە قینە ئە نجام بدەیت .هەروەك ئەفەرموودیە پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە علیە وسلم ) دەفەروویت : (( من شهد ان لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله ، حرم الله عليه النار )). رواه مسلم عن عبادةبن صامت ،والحديث عند البخاري بلفظ.

### دووەم : ( باوەر) ( الا یمان )

هەروەك باوەر هینان بە زمان و ووتە و كارو كردەوە ، پابەندبوونی دل ، زیاد بوونی باوەر بە طاعە ت و خوا پەرستی عبادەت كردن ، هەروەها كەم بوونی باوەریش بە خرا پە كاری كردن گوناهو تاوان ..!!

هەروەك پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم ) دەفەروویت : (( لایدخل النار من كان فی قلبە مثقال خردلة من إيمان )). رواه الترمذي .

واتە : هەر كەسیك بەئەندازەی گەردیلە یەك باوەری هەبی ناچیتە ئاگری دۆزەخەوە ..!؟

### سی یەم : ( نیەت ) ( الاخلاص )

نیەت پاكی بۆ خوای گەورە بە تنها پەرستن بۆ خوا بەنیەتیكی پاك بیگەرد دوور لە شریك هاوبەش بریاردان ، عبادەت و نزا پارانەوە پەنا گرتن بەتەنها بۆ ( خوای گەورە ) بیت توكل بەو زاتە هەبیت ..!!

پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) دەفەروویت : (( لن یوافی عبد یوم القیامە یقول لا إلە إلا اللە یبتغی بها وجە اللە إلا حرم اللە علیەالنار )).رواه البخاری . واتە : هەر بەندە یەك لەرۆژی قیامەت دا ووتیەتی لاإلە إلا اللە ، ئەوا خوای گەورە دۆزەخی لی حرام دەكات ..!!

## چوارەم : ( گریان لە ترسی خوا ) ( البكاءمن خشيه الله )

پیغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووێت : (( لا يلج النار رجل بكى من خشيه الله )).الشيخ البانى .

واتە : هەر كەسێك لە ترسی خوا بگری ئەوا خوا ئاگری دۆزەخی لەسەر حەرام دەكات .

## پێنچەم :( پاریزگاری كردن لە پێنچ نویژە كە ) ( حافظ الصلوات الخمس )

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووێت : (( من حافظ على الصلوات الخمس ،ركوعهن وسجودهن ومواقيتهن ،وعلم أنهم حق من عندالله دخل الجنة ، او قال وجبت له الجنة ، أو قال حرم عليى النار )).رواه احمد . واتە :هەر كەسێك پاریزگاری لە پێنچ نویژە كەی بكات و ،وە كو كرنۆژ بردن سووجدە بردن بەچاكی لە كاتی خۆیدا نویژەكانی بكات ، وە بزانیت ئەوا بۆ خوای خۆی دەكات حەقی خوایە ، دە چیتە بەهەشتەوە ،یان لە بەهەشت دا دەبیت ، یان ئەوە تا ئاگری دۆزەخی لی حەرام دە كریت.

## شەشەم : ( نویژەی بە كۆمەل ) ( الصلاة فى الجماعه )

هەر كەسێك نویژەكانی بەردەوام لە مەزگەوتدا بكات لە گەل كۆمەلی موسلمانان دا دوای ئیمامی نویژ بكات ، ئەو خوای گەورە بری دەكات لە ئاگری دۆزەخ ..؟!

پیغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووێت : (( من صلى الله أربعين يوما فى جماعه يدرك التكبيرة الأولى كتب له براءتان : براءة من النار ،وبراءة من النفاق )). رواه الترمذي عن أنس .

واتە : هەر كەسێك بۆ ماوەی ٤٠ رۆژ لە گەل كۆمەلی موسلمانان لە مەزگەوتدا نویژی بە كۆمەل بكات و تكبیر بكات .خوای گەورە دووبرائەتی بوودە نووسیت : برائەتی یەكەم ناچیتەناو ئاگری دۆزەخەوە برائەتی دووە م ناچیتەریزی دووروووەكانەوە ..؟!

## حەوتەم : ( نویژی بەیانی و نویژی عەسر ) ( الصلاة فجر والعصر )

پیغەمبەر( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( لن یلج النار أحد صلی قبل طلوع الشمس وقبل غروبها )) . رواه مسلم عن عمارة بن رؤيبة . واتە : ئەو کەسەی نویژی بەیانی پیش رۆژهەلاتن بکات یان نویژی عەسر پیش خۆرئاوابوون بکات ،ئەوا خوای گەورە ئەو کەسە بە ئاگری دۆزەخ ناسووتینیت .

## هەشتەم : ( سووننە ) ( سنة الظهر )

پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( من حافظ علی أربع ركعات قبل الظهر و أربع بعدها حرم علی النار )). رواه الترمذي .

## نۆیەم : ( رۆژوو ) ( الصیام )

هەرکەسیک بەرۆژوو بیت لە پیناوی خواد بە شەو دەست لە خواردن بەردات تائیوارە دەست بە فتار بکاتەوە بۆ رەزامەندی خوا ئەوا ئاگری دۆزەخی لەسەر حەرام دەکریت ،هەروەك ئەم فەرموودەیەی پیغەمبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( الصیام جنه من النار )).رواه النسائی .

## دەیەم : ( رەوشت بەرزی ) ( حسن الخق )

پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( حرم علی النار کل هین لین سهل قریب من الناس )).رواه احمد. واتە : ئە کەسانەی کەم زۆر خۆیان دەگونجینن لە گەل خەلك و ئیش وکاری خەلك ئاسان دەکەن رەوشتیکی زۆر بەرزیان هەیە ..؟!

## یانزەم : ( تیکۆشان لە پیناوی خوا ) ( الجهاد )

جیهاد جا چ لەریگای بەرگری کردن بیت لە ئیسلام یان چ لە ریگای بانگەوازی بیت لە پیناوی خوادا ..؟؟

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( ما اغبرت قدما عبد فی سبیل الله فتمسه‌النار )). رواه البخاری . هەر کەسیك هەنگاویك یان تۆزیك هەنگاو بنیت بۆ جیهاد و تی کۆشان ئەوا ئاگری دۆزەخ لی نادات .

## دوانزەم : ( پاسەوانی لە پیناوی خوا ) ( الحراسه فی سیل الله )

هەر کەسیك پاسەوانی بکات لە پیناوی خوا ئەوا ئاگری دۆزەخ لی حرام دەکریت ..؟؟

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( حرمت عین علی النار سهرت فی سبیل الله )).رواه النسائی . واتە : هەر چاویك پاسەوانی بکات لەشەویك دا لە پیناوی خوادا خەولی نەکەویت ئەوا ئەوچاوە ئاگری دۆزەخی لەسەر حەرام دەبیت ..؟؟

## سیانزەم :( ئارام گرتن لەسەر لەدەستدانی مندال ) ( الصبر علی فقدان الولد )

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( من دفن ثلاثة من الولد حرم الله علیه النار )).رواه التبرانی ، وصححه الالبانی . واتە : هەرکەسیك سی مندال بەدەستی خۆی کفن بکات و لەدەستی بدات ئەوا ئاگری دۆزەخی لی حرام دەکریت .

## چواردەم : ( بەرگری کردن لە عرض و ناموسي موسلمان ) ( الذب عن عرض المسلم )

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( من ذب عن عرض أخيه بالغيبة كان على الله أن يعتقه من النار )).رواه احمد . واتە : هەرکەسیك بەرگری بکات لە عرض و ناموس و شەرفی برای موسلمان لە بوختان کردن غیبەت کردن ئەوا خوای گەورە رزگاری دەکات لە ئاگری دۆزەخەوە ..!!

## پانزەم : ( دەستیك بە حەرام بۆ کەس دریژ نەکرابێت ) ( الكف عن المحارم الله )

ئەو دەستەی کە بۆ حەرام دریژ نە کراوە هەمووئەوانەی کە خوا حەرامی کردوون لەسەری ،واتە دوور کەوتنەوە لە حەرام کراوەکانی خوا ،هەروەك پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( ثلاثة لا ترى أعينهم النار : عين حرست في سبيل الله ، وعين بكت من خشية الله ، وعين كفت عن محارم الله )). رواه التبراني ،وصححه الالباني . واتە : ئەو سی چاوانە ئاگری دۆزەخ نا بینن ،ئەو چاوەی لە پیناوی خوا شەو نخونی کردووە ،ئەوچاوەی گریاوە لە بەر ترسی خوا ، ئەو دەست و چاوەی خۆیان لە حەرام کردن پاراست ..!!

## شانزەم : ( پارانەوە ) ( الد عا )

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( ما استجار عبد من النار سبع مرات في يوم إلا قالت النار : يا رب إن عبدك فلانا قد استجارك منى فأجره )). اشيخ الالباني وصححه .

## حەفدەم : ( رزگار کردنی کویلە ) ( عتق الرقاب )

پیغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت: (( من أعتق رقبه مؤمنه أعتق الله منه بكل عضو منه عضوا من النار )). رواه البخاري .

## هەژدەم : ( كفالەتی سی کچۆلە یان بەخێوکردنی سی کچۆلە ) ( كفاله البنات )

پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووێت : (( ليس أحد من امتي يعول ثلاث بنات أو ثلاث اخوات فيحسن إليهن إلا كن له سترا من النار )). رواه البيهقي . واته : نفقەی سی کچۆلە بکەی بەشێوەیەکی زۆر باش بەخێویان بکات ئەوا خوای گەورە ستری دەکات لە ئاگری دۆزەخەوە ..!!

## نۆزدەم : ( ذكر كردن و نزاو پارانەوە لەخوای گەورە پێش مردن )

پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووێت : (( إذا قال العبد : لا إله إلا الله والله أكبر ،قال الله : صدق عبدي لا إله إلا أنا وأنا أكبر ،فاذا قال: لا إله إلا الله وحده ، قال : صدق عبدي لا إله إلا أنا وحدي ، فاذا قال : لا إله إلا الله لاشريك له ، قال : صدق عبدي لا إله إلا أنا ولا شريك لي ، فاذا قال : لا إله إلا الله له الملك وله الحمد قال : صدق عبدي الاإله إلا أنا لي الملك ولي الحمد ،فاذا قال : لا إله إلا الله ولا حول ولا قوة إلا بالله ،قال صدق عبدي لا إله إلا أنا ولا حول ولا قوة إلا بي ، من رزقهن عند موته لم تمسه النار )). رواه ابن ماجه .

## بیستەم : ( زیندووکردنەوەی شەوانی رمضان ) ( إحياء ليالي رمضان ).

پیەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووێت: (( إذا كان أول ليلة من شهر رمضان صفدت الشياطين ومردة الجن وغلقت أبواب النار فلم يفتح منها باب ، فتحت أبواب الجنة فلم يغلق منها باب ،وينادي مناد كل ليلة ، يا باغي الخير أقبل ، ويا باغي الشر أقصر ،ولله عتقاء من النار وذلك كل ليلة )).رواه الترمذي عن ابي هريرة .

الحمد لله رب العالمين ،والعافيه للمتقين ،ولا عدوان إلا على الظالمين ،والصلاة والسلام على إمام الأولين والآخرين ، وقائد العز المحجلين ، و على وأصحابه إلى يوم الدين ، أما بعد :

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾**ال عمران١٠٢** .

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ **النساء ١** .

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا (٧٠) يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ **الاحزاب ٧٠-٧١** .

أما بعد : فإن أصدق الحديث كتاب الله ، وأحسن الهدى هدى محمد (صلى الله عليه وسلم ) وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار .

## كورتەباسكی : مالی نعیم

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ﴾ال عمران ١٣٣ .واتە: پەلە بن و پیشبرکی بکەن تا دەگەن لیخۆشبوونی پەروەردگارتان و بە هەشتیك كە پانتایەكەی ئاسمان و زەوی گرتۆتەوەو ئامادە كراوە بۆ پاریزگاران .

پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( مەنزلگای هەندیك كەس دەبینی وەكو چۆن ئەستیرە ی گەش دەبینن لەدوورەوە ، فەرموویانە ئەی پیغەمبەری خوا : رنگە ئەوانە مەنزلگای پیغەمبەران بن ، ئەویش فەرمووی : نەخیر . بەلكو مەنزلگای كەسانیكن كە باوەریان بە خوا و پیغەمبەرەكەی هیناوە ، جا لەم سەردەمانەی دوایدا زانراوە ئەستیرە چەندە گەورە گەورە هەیە كە خۆر لە ئاستیاندا زۆر بچوكە چ جای زەوی ..!!

برای بەریزی موسلمان خوشكی بەریز پیشبەركی بكا بۆ ئەو بەهەشتەی كە ( خوای گەورە ) بۆی ئامادە كردووین ، چونكە بەهەشت پاداشت و ریز لینانی ( خوای گەورە ) یە بۆ بەندە كانی بە باشترین شیوە پاداشتی بەندە كانی دەداتەوە ، بی گومان پاداشتیكی هەر مەزن و هەرە گەورە یە ، كە خودا بۆ ئەو كەسانەی ئامادە كردوە كە ، تقوای خوا دەكەن خۆیان دەپاریزن لە خراپەكاری لە ژیانی دونیادا ، هەروەها یەك خواپەرستی راستەقینە دەكەن بە نیەت و دلیكی پاك بیگەرد خوا دەپەرستن بەتەنها ، فەرمان بە چاكە دە كەن خۆیان دوور دەكەنەوە لە قەدەغەكراوە كانی ( خوای گەورە ) وپیغەمبەرە كەی ( صلی الله علیه وسلم ) جا موسلمانی خۆشەویست لە خوا ترس دەست پیشخەر بە بۆ ئەم بە هەشتە كە پانتایەكیە بە ئەندازەی ئاسمانەكان و زەوییە ، بەلی بە هەشتیك كە نەبەچاو بینراوە هەستی پیبكەی نە بەدلی هیچ كەسیكدا هاتووە نەكەسیش بیستوویەتی ..!؟

ئا ئەوە تا ( خوای گەورە ) لە قورئانەکەی وصفی ئەم بەهەشتەمان بۆ دەکات دەفەرمووی: ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى الَّذِينَ اتَّقَوْا وَعُقْبَى الْكَافِرِينَ النَّارُ﴾الرعد ٣٥ .واتا: وینەی نموونەی ئەوبەهەشتەی بەلێن دراوە بە پاریزگاران کە جوان و رازاویە چەندەها رووبار رەوان و جاریە بە ژێر درەختەکان و بە بەردەم کۆشکە کانیدا ، خواردن و خواردنەوەی خۆش و هەواوی سازگار و شنەی شەمالدا ئەوەیی سەر ئەنامی بی باوەرو خوانە ناسانیش ئاگری دۆزەخە ..!!

بەلی مالی نعیم ئەوەندە پاك و بیگەردە هیچ پەل و ماکیکی پیوە نیە ، ئەوە ی کە ( خوای گەورە ) لە بارەی مالی نعیم بۆی باس کردنی لە قورئانە پیرۆزەکەی داو وە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ ی باسك کردووین لەفەرموودەکانی ،بەلی مالی نعیم هیچ عەقلیك هیچ زانایەك ناتوانیت زۆر بە جوانی وصفی بکات چونکە عەقل تەعاملی ناکەت چۆن وصفی بکات ،لەریك و پیکی لە خۆشیە کانی ناو مالی نعیم دا هیچ تصورە تەعامل ناکات لە خۆشی یەکانی مالی نعیم ،چونکە عەقل دەستەوەسان دەوەستیت لە بەردەم مالی نعیم یان تصور دەتاسینی ،یان میشك یان سەر کیژ دە کات لەبەردە خۆشی نازو نیعمەتەکانی مالی نعیم ، بەراستی نعیمە بۆ ئەو کەسانەی کە تقوای خوا دەکەن و لەخوا دە ترسن فەرمانەکانی جی بەجی دەکەن ،بەلی لە مالی نعیم عقل دەستەوەستان دەوەستیت لەبەردەمیدا ..؟!

هەروەك ئەم فەرموودە قودسیە دەفەرموویت : (( أعددت لعبادي الصالحين مالا عين رأت ولا أذن سمعت ولا خطر على قلب بشر )). رواه البخاري كتاب بدخلق باب جاء في صفة الجنة .

واتە : بەهەشتیکی وام بۆ بدە صالحە کانی خۆم ئامادە کردووە ، نە چاویك بینیویەتی ، نە گوویەك بیستیویەتی ، نە دلی هیچ مرۆڤیك بەسەری دا رە تبووە ..؟!

پاشان پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( قرأوا أن شئتم : ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ السجدة١٧ . واتە : جا هیچ کەس لەو بەختەوەرانە نازانیت چی بۆ هەلگیراوە وشاراوەتەوە لە نازو نیعمەتی جۆراو جۆر لای پەروەردگاری ، کە چاوان پیی گەش دەبنەوە و بەدیتنی شاد دەبن ، لە پاداشتی کارو کردەوەی چاك و پاکیاندا کەئەنجامیان دەدا ..؟! بی گومان گەورەی و خۆشی نازو نیعمەتەکانی مالی نعیم ئەو کات بەدریار دەکەویت کە بەراوردیك بکەی لە نیوان نازو نیعمەتەکانی ژیانی دونیادا ،چۆنکە خۆشی ژیانی دونیا لە چاو خۆشی

نازونیعمەتەکانی مالی نعیم هیچ نیە هەر بەهیچ ناچیت ،چونکە کاتیکی زۆر کەم کورتی چاو قووچانیکە لەدونیادا تەواو دەبیت ،خۆشی دونیا لە چاو خۆشی مالی نعیم وەك سراب وایە لە بیابانیکی گەورە دا..؟!

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( موضع سوط في الجنة من الدنيا وما فيها ... )). رواه البخاري . واتە : جیی قامیەك لە بەهەشت چاك ترە لەدنیا و هەموو ئەو شانەی کە تییدایە ..؟!

بی گومان دیارە و ئاشکرایە مرۆڤ بەردەوام و بۆ هەمیشە بەدوای بەختەوەری خۆشی خۆی دا دەگەریت شەو نخونی بۆ دەکات تاکو لەژیانی دونیادا بحەسیتەوە تیداد بەخۆشی بژیت ،هیچ دەرگایە نامینی پەنا بۆ ببات بۆئەوەی بەختەوەر بیت دوور بیت لە ناخۆشیەکانی ژیانی دونیادا ، بەلام ئە ژیانەی دونیا چ ئازاریك و چ زەحمەتیکەی تیدایە بۆ مرۆڤەکان بەردوام بەدوای خۆشیە کانی دا دەگەرین ، کەچی تەواو دەبیت ماوەیەکی زۆر کورتە بەسەری دەبەن ،بەردوام بۆ هەمیشە هەولی خۆش کردنی ژیانی دەدات ،کەچی ئەوەندن ژیانی دونیا نارەحەت و ناخۆشە ، بەلی بەم قوناغانەی ژیان دا تیپەر دەبن بە تالی وشیرینیەوە ، بەلام ئایا کەس تەنها خۆشیەکانی ژیانی دونیا بینیوە بی ناخۆشیە کان بی گومان نا...؟؟؟

گومانی تیدا نیە کە هەموو کەسیك مەبەست و ئامانجیکی هەیە ، ئەو ئامەنجەش رفتارو کارو کردەوە کانیەتی ئاراستەی دەکات و ،وە رەنگدانەوەی هەیە لەسەریان ، لەمەش جیاوازی نیە لە نیوان زانا ، نەزان ، باوەردار وبی باورە و خوا ناس و خوانەناس خرا پە کار و چاکە کار ، چونکە هەموویان ئامانجیان هەیە ،بەدوای گەشتن پی گەیاندیان بۆ ئامانجەکانیان ماندوون و هەولی بۆ دەدەن ..؟! موسلمانی راستەقینە و لەخوا ترس دەبیت ئامانجی بەدیهینانی رەزامەندی خوا بیت بۆ بەدەست هینانی ئە مالە ی کە ( خوای گەورە ) لە کتابە پیرۆزەکەییاسی دەکات بۆ ئەو کەسانەی ئامادە کردووە کە فەرمانەکانی جی بەجی دەکەن دووردەکەونەوەلەقەدەغەکراوە کان ،ئە گەر رەزامەندی خوای بەدەست هینا ، ئەوا ئامانجەکەی لەژیانی دونیادا بەدی هینا ،وە مالی نعیم بۆ ئامادە دەکریت بۆ هەتاهەتایی بۆ هەمیشەیی، بەلب ئەم ئامانجەش دەبیت تی کۆشانی بۆ بکەیت تقوای خوا زۆر بکەیت نزاو پارانەوەکان بۆ گەیشتن بە مالی نعیم زۆر بیت ،چونکە مالی نعیم مالیکی هەمیشەیی و بۆ هەتاهەتایی تیدا دە حەسیتەوە ئەوەی لەدونیادا کری جی بوو ئەوا مالیکی تاپۆیی هەمیشەیی دەست دەکەویت بی گومان هەموو مان لەدونیادا کریجین بۆ ماوەیەك تیدا دەژین جا دەبیت زخیرە چاکە کۆ بکەینەوە بۆ ئەو مالە لە بەهەشت دا بۆمان ئامادە کراوە ، کە ناچاو بینیویەتی گوییی بیستیویەتی لە خۆشی بەهەشت نازونیعەتەکانی مالی نعیم .

## مالى نعيم بۆ ( برواداران )

بى گومان بەهەشت يان مالى نعيم بۆ ئەو كەسانەيە كە لەژيانى دونيادا كارو كردەوەى چاكەيان ئەنجامدا بەرگەى ناخۆشيەكانى ژيانى دونيايان گرتووە ،باوەرى تەواويان بە خوا و پيغەمبەركەى هەبووە ، لەژير فەرمانەكانى خوا و پيغەمبەرەكەى( صلى الله عليه وسلم ) دا دەر نەچوون ، وە دوور كەوتوونە تەوە لە قەدەغەكراوەكانى خوا و پيغەمبەرەكەى ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمانيان كردووە بەچاك و نەهى يان كردووە لە خرا پەكارى ، خۆيان پاراستووە لە خرا پەكارى و تقواى خواى گەورە يان كردووە ،وە زۆر لە خوا ترساون پشت و پەنايان تەنها بەخواى گەورە بووە ،هاناو هاواريان تەنها بۆ خوا بووە ، لە پيناوى خوادا تى كۆشاون جهادى سەرو مالى خۆيان كردووە بۆ خزمەت كردن بە پەيامەكەى خواو پيغەمبەرەكەى( صلى الله عليه وسلم ) واجبە كانى شەرعى و ئاينى پيرۆزى ئيسلاميان بەجوانى جى بەجى كردووە ،وەك نويژەكانيان بەچاكى ئەنجام داوە كاروكردەوەى چاكەيان كردوە و سيلەى رەحميان بەديهيناوە كارى خەلكيان سهل كردووە ، زكاتى مالى خوايان داوە حەجى مالى خوايان كردووە ، خير چاكەى زۆريان كردووە لەگەل خەلكى هەژاردا ، لە پيناوى ئيسلام خۆيان بەخت كردووە بۆ سەرخستنى پەيامەكەى پيغەمبەرى خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئازارو ئەشكە نجەو نارەحەتى و شەونخوونى ماندى بوون لە پيناوى ئيسلامدا ،يارمەتى دانى هەژاران و دەست بەسەرهينانى هەتيوان و ،مانەوە لە مەزگەتەكان بۆ بەدەست هينانى رەزامەندى خوا ،وەلەگەل كۆمەل يموسلمانان دابوونە لەخۆشى ناخۆشيە كاندا ، ئازارو ئيشى دونيايان زۆر چيشتووە بۆ بەدەست هينانى مالى نعيم ، بەلى ئەمانە بۆ خۆيان ماليك بنيات دەنين لەو بەهەشتەى كە ( خواى گەورە ) دەفەرموويت : ﴿سَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ الحديد ٢١ . واتە : كەواتە پيشبركى بكەن بۆ بەدەست هينانى لى خۆشبوون لەلايەن پەروەردگارتانەوەو بەدەست هينانى ئەو بەهەشتەى كە پانيەكەى وەك پانتايى ئاسمان و زەويە ،ئامادەكرراوە بۆ ئەوانەى كە ئيمان وباوەر يان هيناوە بە خوا و پيغەمبەرە كانى ،ئەويش خۆى زيادە ريزيكى تايبەتى لەلايەن خواوە كە دەيدات بەو كەسانەى كە خۆى دەيەويت ، هەر خوا خۆى خاوەنى بەخشش وبەخشندەيى زۆر گەورەو بى سنوورە ..؟!

بەلی ئا ئەووتا جاریکیان پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە لای خیزانی ( یاسر ) تیپەری کە لەو کاتەدا بوو کە کافرانی قورەیش سزایی خیزانی ( یاسر ) یان دەدا ، پیغەمبەری خواش ( صلی الله علیه وسلم ) بە خیزانی یاسری فەرموو: (( صبرا آل یاسر فإن موعدكم الجنة )). واتە : ئەی خیزانی یاسر خۆگربن و ئارامتان هەبیت چونکە بەراستی بەلینتان بە بەهەشت پی دراوە . هەروەها دیسانەوە فەرمووی : (( آلا إن سلعة الله غالية ، ألا إن سلعة الله الجنة )). راواه البخاري برقم ٩٥٤ . واتە : بەراستی کالای خوا گران بەهایە ، وە بزانن کالای خوا بریتیە لە بەهەشت ..؟! وە هەروەها لە غەزای بەدر دا پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بە هاوەلە کانی فەرموو : (( قوموا إلى الجنة عرضها السموات والارض )) .واتە : هەستن را پەران بەرەو بەهەشتیك کە پانتایەکەی بە ئەندازەی ئاسمانە کان و زەویە ..؟!

هەروەها یەکیك لە دوعاو نزا کانی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بریتیە بوو لەوەی کە دەی فەرموو: (( اللهم إني أسلك الجنة وما قرب إليها من قول وعمل )). واتە : ئەی پەروەردگارا من داوای بەهەشتت لی دەکەم و ئەو گوفتارو و کردارەش کە نزیکم دەکاتەوە لە بەهەشت ..؟! بەلی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەزانیت کە هەر کەسیك بەهەشت بکاتە بە ئاما نجی راستەقینەی خۆی و خۆی بۆ تەرخان بکات بۆ بەدەست هینانی ،ئەوا ( خوای گەورە ) دل ناخی پر دەکات لەدەولەمەندی و دونیاش بە زەلیلیەوە دیتە بەردەستی ، وەکو لەم فەرموودەیە دا هاتووە کە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( من كانت الاخره همه جعل الله غناه فى قلبه وجمع له شمله ، وأتته الدنيا وهي راغمة ، ومن كانت الدنيا همه جعل الله فقره بين عينيه ،وفرق عليه شمله ،ولم يأته من الدنيا إلا ما قدر له )). الصحيحه برقم ٩٤٩. واتە : ئەوەی هەموو غەمی دوا رۆژ بیت ، ئەوا ( خوای گەورە ) دولەمەندیە کەی دەخاتە نیو دلیەوە ، وە کارە پەرتەوازەکانی بۆ کۆدەکاتەوە ، وە دونیاش بە ملکەچی و زەلیلی دیتە بەر دەست ، وە ئەووشی هەموو غەمی دونیا بیت ، ئەوا ( خوای گەورە ) هەژاری و نەداری دەخاتە نیو چاوانیەوە ،کاروباری پەرتەوازە دەکات و ،دونیایشی بۆ نایەتە بەردەست ئەوەندە نەبیت کە بۆی نووسراوە ..!!

بەلی هاوالانی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) زۆر تامەزرۆی مالی نعیم بوون ،تاکە ئامانج و هیواو ئاواتی هاوالانی پیغەمبەری خوا بوو (صلى الله عليه وسلم ) هەر بۆیە ئەم ئاینەیان بەم رۆژە گەیاند ، چونکە لە پیناوی خوا تی کۆشانیان بۆ کرد ،وە بۆ بەدەست هینانی ئەو مالە ی کەبۆ باوەرداران ئامادەکراوە ، بی گومان ئەو مالەی نعیم ئەو پاداشتەی (خوای گەورە ) بۆ ئامادە کردووین ، بەس بینینی بەقەد هەموو دونیا خۆشە دیارە پاداشتیکی ئەوەندە گەورەیە کەهیچ وەصفیك ناتوانریت هەروەستەی لەسەر بکات وەصفی بکات چونکە عەقل تعاملی ناکات ..!!هەر بۆیە هاولانی پیغەمبەر خۆیان بۆ بەخت کردووە زۆر پەرۆشی بەهەشتی خوا بوونە ،هەروەك پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم )بە ربیعە ئەسلمی دەفەرموویت : (( سنلقى فقول : أسلك مرفقك في الجنة )) واتە : دوام لی بکە : ئەویش دەلیت : دوای ئەوەت لی دەکەم لەگەلتدا بم لە بەهەشتدا ..؟! وە (انس بن نضر ) لەرۆژی ئوحودا دەلیت : (( يا سعد بن معاذ الجنة ورب النضر ،إني أجد ريحها من دون أحد )). واتە : ئەی سعدی کوری موعاز ! ئەوە بەهەشتە سویند بە پەروەردگاری نضر ، من بۆنی بەهەشت دەکەم لەدامینی چیایی ئوحود دا ..؟!

وە (جعفري کوري ابو طالب ) لە رۆژی غەزای مۆئتە دا ووتی : (( يا حبذا الجنة واقتربها ....طيبة وبارد شربها )). واتە : خۆزەگەم بە بەهەشت و لی نزیك کەوتنەوەی خۆشی و خواردنەوەی ئاوی ساردو فینکەکەی ..!!

(عمری کوری جەموحە ) کە زۆر دەشەلی و لە رۆژی ئوحودا ووتی : (( إني لأرجو أن استشهد فأطا بعرجتي هذه في الجنة ،وقال له رسول الله : كاني أنظر إليك تمشي برجلك هذه صحيحة في الجنة )). رواه احمد بسند صحيح . واتە :ئومید دەکەم کە شەهید بم ئەوقاچە شەلام بخەمە نیو خاکی بەهەشت دا ، پیغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم ) پی فەرموو : تەماشا دەکەم لە بەهەشت دا بەو قاچەت ری دەکەیت و ساغ وسەلامەتیت و شەلەیت نیە ..؟!

شيخ ئيسلام ابن تيميه دەفەرموويت: (( إن فى الدنيا جنه من لم يدخلها ،فلن يدخل جنه الاخره .. قالوا : ماهى ؟ . قال : إنها جنه الإيمان . وقال مره: مايصنع أعدائى بى ؟ أنا جنتى وبستانى فى صدرى ،إنى رحت فهى معى لا تفارقنى ، إن حبسى خلوه ، وقتلى شهاده ، وإخرجنى من بلدى سياحه .

واته: دونيا بەهەشتە ئە گەر بچيتە ناوى . هەروەك نەچيتە بەهەشتى كۆتايى ،فەرموويان : چۆن ؟ فەرمووى : چونكە بەهەشتى باوەرە يان ئيمانە . وە هەروەها فەرمووى : كاتيك دوژمنى تيدايە ،ئەوا وەك باغ وبيستانە بۆ سينەى من ، كاتى دەچمە ناوى هيچ لى دوور ناكەوم ،چونكە بەنديخانەكەى بۆ من خلوتە يادى ( خواى گەورە يە ) كوشتنى پلەى شەهيد بوونە ،وە دەر كردن و دووركردنەوەم بۆ شوينى كى دوور ئەوا وە گشت وگوزار وايە لە لام . بەلى ئەو بەهەشتە بەدەستى هينانى زۆر گرانە ،چونكە دەورى گيراوە بە درك و ئازارو نارەحەتى ئيش و ژانى زەحمەتى دونيا ، وە ئەلماسيك يان ياقووت لە بنى دەريا بيت وايە ئەستەمە بەدەست هينانى ، تەنها بۆ ئەو كەسانە نەبيت كە باوەريان دامەزراوە ئيمانيكى راستەقينەيان هەيە ،هەروەك پيغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموويت : (( حفت الجنة بالمكاره وحفت النار بالشهوات)).رواه البخاري ومسلم . واتە : چواردەورى بە هەشت دراوە بە نارەحەتيەكان وە چواردەورى دۆزەخيش بە ئارەزوو خۆشيە كانى دونيا ..!!بەلى براى بەريز خوشكى بەريز بەهەشت ئەو شوينەيە كە هاوالانى بەريزى پيغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) و پيشينەكان پياو چاكان هەولى زۆريان بۆ داوە بۆ بەدەست هينانى ،تەنانەت پيشبركيان لەسەر كردووە بۆ بەدەست هينانى ،وەك خواپەرستى پاك وبيگرد وئيمانى دامەزراوە ،خير چاكە كردن لە گەل خەلك دا ، چونكە ئەو بەهەشتە هەركەسيك بچيتەناو باغەكانى بەراستى بەختەوەر ترين مرۆڤ دەبيت ،سەر كەو توو ترين كەس دە بيت لەژيانى دونيايى دا ،بەلى بيگومان تقواى خوا لە خوا ترسان شەو نويژى زۆر چاكەى زۆر دوور كەتنەوە لە خراپەكان ،بەلى ئەمەبەلينى خوايە بۆ ئيمە بەهەشت پاداشتيەتى ، خۆ بەختەوەر ترين كەسى دونيا بە قەد گەرديلەيەك بەختەوەرى مالى نعيم بەختەوەر نيە ، جا چ پاشا بيت لەدونيا يان خاوەنى هەموو دونيا بيت بەقەد گەرديلەيەكى بەختەوەرى بەهەشت دلى خۆش نابيت ، بى گومان هەر كەسيك بچيتە ماليك لەدونيا دەبيت لەدەرگا بچيتە ژوورەوە دەبيت دەرگاى چوونەژوورەوەى مالى نعيم چۆن بيت چەندە جوان خۆش بيت بۆ ئەو كەسەى كە دەچيتە ژوورەوەى مالى نعيم ..!؟

برای بەڕیز خوشکی خۆشەویست بیت خۆشە مالی نعیم و ئیماندارانت بۆ باسبکەم  کە چۆنە ..؟!

دە گوێی بگرن لەم باس کردنە سەر سورهێنەرە ..!! پرسیار کرا لە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە دیوارە کانی مالی نعیم ئەویش فەرمووی : (( لبنة من فضة لبنة من ذهب ..!! وملاطها ( المادة بينااللبنتين ) المسك الأدفر ..!! وحصباؤها اللؤلؤ والياقوت ..!! وتربتها الزعفران ..!! من يدخلها ينعم لا يبأس ..!! ويخلد لا يموت ..!! ولا تبلى ثيابهم ..!! ولا يفنى شبابهم ..)). رواه الترمذي ، و احمد ترخريج المشكاة ( ٥٦٣٠. واتە: خشتیکی لە زیوە ..!! خشتیکی لە زیرە ..!! ئەو شتەشی کەلەبنی یان لەنیوان ئەم دوو خشتەدا هەیە  میسکیکی زۆر بۆن خۆشە ..!! وە زیخ وچەویشی للو لو یاقوتە ..!! وە خۆلەکەشی زعفرانە ..!! هەر کەسیك بچیتە ناوی هەر لە نازو نیعمەتدا ئەبیت بەبی هیچ نارەحەتیەك ..!! وە بە هەمیشەیی دەژی لە ناوی دا هەرگیز نامریت ..!! وە پاشە رۆشیان نابیت ..!! وە هەمیشە بەگە نجی و لاویەتی دەمینەوە پیر نابن ..!! بەلی ئەو رۆژە ی کە ئەهلی مالی نعیم بانگ دەکریت پیان دەوتریت ئیوە لەدونیادا چاکە کار بوون خاوەنی باوەرو ئیمان بوون رووتان سپی بوو لەبەرانبەر پەروەردگارتان دەچنە ناو ئەو مالەی کەلەژیانی دونیادا هەولتان بۆ داو بنیاتان دا بوو ،ئینجا فریشتەکانی ( خوای گەورە ) دەلین : ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ﴾الزمر٧٣ . واتە : لەولاشەوە ئەوانەی کەپاریزگار و بەتقوا بوون و بەندەی ملکەچی پەروەردگاریان بوون ، ئەوانەی حسابیان بۆ ئەو رۆژە دەکرد دەستە دەستە و پۆل پۆل بە پەری ریزەوە بەری دەکرین بەرەو بەهەشت ، هەتا کاتی کە دەگەنە ئەوی دەروازەکانی لەروویاندا کراوەیە ولەسەر پشتە ،فریشتە کانی بەپرس وسەرپەریشتیارانی بەهەشت زۆر بە گەرمی و رووخۆشیەوە پیشوازییان لی دەکەن  و دەلین : درود وسلاوتان لی بیت ،ئیوە پاك وخاویننن ،کەواتە فەرموون بچنە ناو بەهەشتەوە ، هاوری لەگەل ژیانی هەمیشەیی و نەبراوە دا ..!!

## گەورەیی و پانتایی  مالی نعیم

بی گومان مالی نعیم زۆر گەورە هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ﴾ ال عمران ١٣٣ .واتە: پەلە بن و پیشبرکی بکەن تا دەگەن لیخۆشبوونی پەروەردگارتان و بە هەشتیك  کە پانتایەکەی ئاسمان و  زەوی گرتۆتەوەو ئامادە کراوە  بۆ پاریزگاران . هەروەها پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) زۆر بە باشی پوختی بۆی روون کردینەتەوە ، کەلە مالی نعیم دا (١٠٠) پلە هەیە  هەر یەکیکیان بەئەندازەی نیوان ئاسمان و زەویە ..!! بی گومان تا ئیستا کەس نەیتوانی وە نیوان ئاسمان و زەوی پیوانە بکات ، تا کۆتایی ئەم جیهانەش کەس ناتوانیت چونکە زۆر گەورەو فەراوانە ، هەروەك پیغەمبەری خوا (صلى الله عليەوسلم ) دەفەرموویت : (( إن الجنة مائة درجة ..!! مابين الدرجتين كما بين السماء والأرض )). رواه البخاري في الصحيح ٢٧٩٠ . واتە : لە ناو بە هەشت دا (١٠٠) پلە هەیە ..!! لەنیوان هەردوو پلە  یەکدا وەك نیوان ئاسمان و زەوی وایە ..!! بەلی گەرویی فەراوانی مالی نعیم لە گەورەیی دەرگا کانی و ، کۆشك و تەلارەکانی و ، وە درختەکانی و بەروبوومی درەختەکانی  دەردەکەویت..!! هەروەك  ئەم فەرموودەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) کە(ابو سعيد خدری ) – خوا لی رازی بیت – بۆ مان دە گیریتەوە دەلیت : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم )دەفەرموویت : (( أن ما بين المصراعين (المصراعين: أی جانبی الباب ) الجنه مسيره أربعين سنه )). صحيح الجامع ٣١٩٠ . واتە : لە نیوان ئەم لاو ئەلای دەرگاکانی بەهەشت دا  ماوەی ریگای رۆیشتنی (٤٠) سالە ریگایە ..؟! هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا کە (ابو موسى لاشعری ) – خوا لی رازی بیت – بۆ مان دەگیریتەوە لە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( أن للمؤمن  في الجنةخمة  من للؤلؤة واحدة  مجوفة ( مجوفة اي مفرغة من الدخل ) طوطها – في رواية – عرضها  ستون (٦٠ ) ميلا )). اخرجه مسلم في الصحيح . واتە : خاوەنی ئیمان یان باوەرە لەدونیادا ، چادریکی هەیە یان خیوتیکی هەیە لە بەهەشتدا لە مرواریەکی نا بۆش دریژیەکەی یان بەرزایەکەی  لەریوایەتیکی تردا یان پانتایەکەی (٦٠ ) میلە ..؟! واتە نزیکەی ١٠٠ کم دەبیت ..؟!

هەروەها لە (ابو هريره )وە- خوا لی رازی بیت – بۆ مان دە گیریتەوە لە  پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( أن في الجنة لشجرة يسير الراكب في ضلها مائة عام )). رواه البخاري في صحيح ٤٨٨١. واتە  : لە ناو بەهەشت دا درختیك هەیە ئەسپ سواری تیژ رەوە  بۆ ماوەی (١٠٠) سال لەژیر سیبەرەکەیدا براوات  وهیشتا تەواو نابیت ..؟! لە (ئەنس )وە – خوا لی رازی بیت – بۆ مان دە گیریتەوە  لە  پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( رفعت لي سدرة المنتهى فاذا نبقها مثل قلال (قلال :اي الجرار ) هجر ، واذا ورقها مثل أذان الفيلة )) رواه البخاري ٣٢٠٧ . واتە :سدرە منتهى نیشاندرا

بینیم گەلاكانی بە ئەندازەی گوێی فیلێكە دەبوو بەرووبوومەكە وەكو كۆپلە گەورە كانی ناوچەی هجر دەبوو ..؟!لەریوایەتەكەی ( عوتبە ) دا – خوا لی رازی بیت – فەرموویەتی : (( قام أعرابي إلى الر سول الله ( صلى الله عليه وسلم ) فقال : فيها عنب – ( يعني في الجنة ) يا رسول الله ..؟ قال (( نعم )) قال : ما عظم العنقود ..؟! قال : (( مسيرة شهر للغراب الابقع لاينثني ولا يفتر )) . اخرجه ابن حبان ( الصحيح )

واتە : دەشتەكی یەك واتە :لە( اعرابیە كان ) هاتە لای پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) وە پیی ووت : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) : ئایا لە ناو بەهەشتدا تری هەیە ..؟! پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : ( ووشیە تری یەكی بەئەندازەی یان بە قەد ماوەی یەك مانگ ری فرینی قەلەرەشیكی پەلاوەیە لەم سەرەوە بفریت بۆ ئەو سەر بە بی وەستان ..؟! هەروەها لە فەرموودەیەكی زۆر كاریگەر سەرسام بۆ ئەو كەسانەی كە باوەر بە دۆزەخ بەهەشت ناكەن ..؟! پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( يكون فى النار قوم ماشاء الله ثم يرحمهم الله، ثم يخرجهم .. لوطاف بأحدهم أهل الدنيا لاطعمهم وسقاهم وفرشهم لاينفص ذلك مما عنده )) .اخرجه ابن حبان ( الصحيح ) ٧٤٢٨.

واتە : كەسانیك لە ناوئاگری دۆزەخ دەمینەوە تاكو ( خوای گەورە ) ویستی لیبیت ، پاشان بەر رەحمەتی ( خوای گەورە ) دەكەون لە ناو ئاگری دۆزەخ دەریان دەكات ، واتە : یەكیك لەو كەسانەی ئەهلی دۆزەخ دیتە ناو بەهەشتەوە ، ئەو كەسە گەر هەموو كەسانی سەر زەوی میوانداری بكات لە خواردن جیگاو ریگای مانەوەیان ، ئەوا دەتوانیت خواردن جیگاور ریگاو شوینیا پی بدات بی ئەوەی هیچ لە بەشەكەی خۆی كەم بكات كەبۆی ئامادە كراوە لە بەهەشت دا ..؟! هەروەك فەرانی بەهشت گەورەیی بەهەشت لەژیانی دونیا دا دەردەكەویت كەچەند گەورەو فراوانە ، یەكەم خواردنی بۆ یەكەم كۆمەلی بەهەشت پیشكەش دەكریت خواردنی جگەری حوت و گا یە ..!! بەلی بەهەشت بەندازەی نیعمەتەكانی دەردەكەویت هەروەك ئەم فەرموودەیە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( ثورن ونون ياكل من زيادة كبدهما سبعون ألفا )) . اخرجه اليخاري الصحيح ٦٥٢٠ . واتە : یەكەم خواردنیان خواردنی زیادەی جگەری حوت و گایە كە ( ٧٠ ) هەرزار كەس لی دەخوات ..؟!

بەلی مالی عیم زۆر گەورە و فرەوانە ئەوتا ئەوکەسەی کەلە نزمترین پلە ی بەهەشتدایە (١٠) ئەوەندی مولکی هەموو دونیا پی دەدریت ، کەپانتایەکەی بە ئەندازەی ماوەی (١٠٠) سالە کەبەچاوی خۆی دەبیینیت ، هەروەك لە فەرموودەیە پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دا دەفەرموویت : (( ... فيقول ((الله تعالى)) : الم ترض إن اعطيك مثل الدنيا منذ خلقتها الى يوم افنيتها وعشرة اضعاف ،، فقال له : اشرف ،قال ،فيشرف ،فيقال له : ملكك مسيرة مائة عام ،ينفذه بصرك )). اخرجه الطبراني في المعجم الكبير (٩٧٦٣). واته : (خوای گەورە ) دەفەرموویت: ئایا رازی نابیت ئەوەندەی دونیات پی ببەخشم ، لەو رۆژەی کە دروستم کردوە تا ئەو رۆژەی لە ناوم بردوە ، و (دە) ئەوەندەی ئەوەش ... وەپی دەوتریت بەرزبەرەوە ، دەفەرموویت : بەرزدەبیتەوە ،وە پی دەوتریت : مولکی تۆ ماوەی (١٠٠) سال ریگە یە بەچاوی خۆی دە بینیت ...!؟ بی گومان گەورەیی فرەوانی بەهەشت زۆر لەوە گەورەتر کەئیمە بەنووسینەکانمان فەرموودە ئایەتەکانی (خوای گەورە ) باسی دەکەین بی گومان ئەو بەلگانەی کە هەن لەسەر گەورەیی بەهەشت مالی نعیم زۆر زیاتر لەوە گەورە تر کە مرۆڤ تصوری دەکات ،ئەم بەلگانەش تەنها بۆ بەرچاو روونی مرۆڤە کە بەئەندازەی بیر کردنەوەکانی مرۆڤ کە تاچەند هزور بیر بۆ گەورەیی بەهەشت دەچیت (خوای گەورە ) پیغەمبەرکەی بۆ بەچاو روونی ئەم بەلگانەی بۆ باس کردوین ، ئەگینا زۆر لەوە گەورە تر کە بە هزور بیری مرۆڤ دانایەت چونکە ناتوانیت هزری بەرگەی گەورەیی فروانی بەهەشت بگریت چەند گەورەو فراونە بۆ ئەو کەسانەی کەلەژیانی دونیادا بستیك زەویان نیە لەژیانیك کولەمەرگی دا دەژین ئیمانداریکی راستەقینە بۆ خوا صولحاون ،ئەوانە (١٠ ) جار بە ئەندازەی دونیا مولکیان دەبیت ، ئایا بۆ ناپرسن ئەوکەسە بە ئەندازەی چادریك یان خیوەتیك مولکی هەیە لە بەهەشتدا ، مولکی ئەم کە سە چەندە فرەوانە ..!؟ چەندها جار بەقەد پاشا و سەرۆك سەرکردەکانی جیهانە ، ئای بۆ ئەو کەسەی کە پیشبریك دەکات بۆ بەدەست هینانی مولکی کی هەمیشەیی گەورەو فرەوان ، پر لە نازو نعمەتەکانی (خوای گەورە ) بەلی بیگوما ئەم ووتەیەی (شیخ الاسلام ) زۆر راست و زۆر دروستە بۆ ژیانی دونیا ، کە دەلیت : خۆشترین کردەوە لەژیانی دونیادا ئیمانیکی دامەزراوە بۆ بەندی خوا ، چونکە ئەو ئیمانە دامەزراوە دەبات بۆ بەهەشتی هەمیشەیی ،یان ئەگەر بەندەی خوا تەنها خەمی قیامەتی بیت ئەوا بیر لە ژیانی دونیا ناکاتەوە دوینا زەلیل دەبیت لەبەردەستی دا ، بەلکو بیر لەو ملکە گەورەیەدەکاتەوە کەبەهەشتی پان و بەرینە ، بەلی (خوای گەورە ) پەرتەوازەی دونیا بۆ ئاسان دەکات ئەوەی خەمی قیامەتی بیت .....!؟!

## ناوەکانی مالی نعیم

**بی گومان مالی نعیم یان بەهەشت چەند ناویکی هەیە کەلە قورئانی پیرۆدا هاتووە :**

## یەکەم : جنات النعیم : ( شوینی باغاتی پر لەنازو نیعمەت )

**هەروەها( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾ **الصافات٤٣.**

**( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَاهُمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾ **المائدە ٦٥ . واتە:خۆ ئەگەر خاوەنانی کتیب باوەریان بهینایە و پاریزگار بوونایە ، ئەوە چاوپۆشیمان لە خراپە کانیان دەکرد و لییان خۆش دە بووین و دەمان خستنە ناوبەهەشتی پر لە نازو نیعەتەوە ..؟! هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُمْ بِإِيمَانِهِمْ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾**یونس ٩ . واتە : بەراستی ئەوانەی کەباوەریان هیناوەو کارو کردەوە صاکەکانیان ئە نجامداوە ، پەروەردگاریان بەهۆی ئیمان و باوەری ریك و پیك و دامەزراویانەوە ،هیدایەت و رینموویيان دەکات بۆ ئە نجامدانی هەموو کارو کردەوەیەکی چاك ، لەو جیهانیشدا لە ناو بەهەشتە جۆراو جۆرە پر لە نازو نیعمەتەکاندا چەندەها روبار بە بەردەمیاندا دەروات ..؟! هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :**
﴿الْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾
**الحج ٥٦ . واتە : ئەو رۆژە پاشایەتی و دەسەلات تەنها بەدەست خوایە و فەرمانرەوای لەنیوانیاندا دەکات ، جا ئەوانەی کە باوەریان هیناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئە نجامداوە لەچەندەها باغی پر لە نازو نیعمەتە کاندان ..؟! هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ جَنَّاتُ النَّعِيمِ﴾**لقمان ٨ .واتە : بەراستی ئەوانە ئیمانیان هیناوە و کردەوەی چاکە کانیان ئە نجامداوە ،چەندەها باغچەی بەهەشتی پر لە نازو نیعمەت بۆ یان ئامادەیە ..؟!**

## دووەم : ( الحسنى ):( شوێنی چاکەکاران )

( خوای گەورە ) دەفەرمووێت : ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾يونس ٢٦. واتە : بۆ ئەوانەی کەچاکەیان کردووە ، پاداشتی چاکترین بەهەشتی بەرین و زیاتریش ئامادەیە بەچەندەها قات ، ( لەریوایەتیکی پیشەوا أحمد و مسلم دا ) ( ئەو زیادەیە تەماشا کردنی رووخساری یان بینینی پر لە نوورو جوان و قەشەنگی زاتی پەروەردگارە ) ..!! ، رووخساریشیان رەشی و تالی و ریسوایی و زەلیلی و ماندویتی پیوە دیارنیە ، ئا ئەوانە نیشتەجی بەهەشتن و بۆ هەمیشە ژیانی تیادا دەبە نەسەر ..؟!

## سی یەم :( دار السلام ) ( شوێنی هیمن ئارام بی ترس وسەلامەت ):

( خوای گەورە ) دەفەرمووێت : ﴿لَهُمْ دَارُ السَّلَامِ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَهُوَ وَلِيُّهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾الانعام ١٢٧ .واتە : بە هەشتی پر لە ئاشتی و هیمن وئارامیان بی ترس بیمەیان بۆ ئامادەیە لای پەروەردگاریان ، هەر ئەو زاتە ش پشتیوان و خۆشەویستیانە بە هۆی ئە کارو کردەوەچاکەی کەئە نجامیان دەدا ..؟!

## چوارەم : ( جنات عدن ) ( باغەکانی جیگەی عدن ):

( خوای گەورە ) دەفەرمووێت : ﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾التوبە ٧٢ .واتە : ( خوای گەورە ) بەلینی داوە بە ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان ، بەوەی کەباخەکانی بەهەشتیان پی دەبەخشیت کە چەندەها رووبار بەژیر درەختەکانیدا دەروات و جاریە بە بەردەم کۆشکەکانیاندا ، هاوری لەگەل ژیانی هەمیشەیی و نەبرواوە تیایدا ، هەروەها چەندەها جیگە وریگەو کۆشك و تەلاری خۆش و رازاوەی تایبەتی لە بەهەشتدا لە ناوبای چروپری ( عدن ) دا لەگەل رەزامەندی ( خوای گەورە ) دا کەلە هەموو نازو نیعمەتەکان بە نرخترو گرنگترە ، ئەوە خۆی سەرفرازیەکی زۆر گەورە و بی ئەندازەیە ..؟!

## پینچەم : ( جنه خلد ) ( بەهەشتی هەمیشەیی و نەبراوە ):

( خوای گەورە ) دەفەرموویت: ﴿قُلْ أَذَلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ الْخُلْدِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ كَانَتْ لَهُمْ جَزَاءً وَمَصِيرًا﴾الفرقان ١٥ . واتا: ئەی پیغەمبەر ( صلى الله عليه‌وسلم ) پییان بلی : باشە ، ئە حالە چاکترە، یان بەهەشتی هەمیشە و بەردەوام کە بەلین دراوە بە خواناسان وپاریزکاران ، هەر دەمیکیشە ئامادە کراوە بۆیان ، کە پاداشتەو سەر ئە نجام ..؟!

## شەشەم : ( جنات المأوى ) ( شوینی باەکانی حەوانەوە ):

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿أَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ جَنَّاتُ الْمَأْوَى نُزُلًا بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾السجده١٩. واتا: بەلکو ئەوانەی کە باوەریان هیناوە و کردەوە چاکە کانیان ئە نجامداوە ،شوینیان باغچەکانی بەهەشتە کە بۆ هەمیشەیی جیگەی حەوانەوەو حەسانەوەیانە و هەر لەوی دادەبەزن ،لە پاداشتی کارو کردەوەیەك کە دەیان کرد ..؟!

## حەوتەم : ( دار المتقين ) ( شوینی خۆپاریزان ):

( خوای گەورە ) دەفەرموویت: ﴿وَقِيلَ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا مَاذَا أَنْزَلَ رَبُّكُمْ قَالُوا خَيْرًا لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَلَدَارُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ﴾ النحل ٣٠ . واتا : لەو لاشەوە بەو کەسانە دەوتریت کە خواناسی و پاریزکاریان کردووە ، پەروەردگارتان چی رەوانە کردووە ..؟ چ بەرنامەو کتیبیکی دابەزاندوە ..؟ هەمووان دەلین : خیرو بەرەکەت بۆ هەردوو جیهان بۆ ئەو کەسانەی کەلە جیهانەدا چاکەیان کردووە ، چاکە دیتەوە رییان ، بیگومان جیگەو ریگەی ئە جیهان و خۆشترو چاکتر سازگارتو پر لە نازو نیعمەتترە بەراورد ناکریت لە گەل ژیانی دونیا دا ، ئای چەندە جیگەو ریگەی کۆشك و تەلاری خو ناس و پاریزکاران سازگارو خۆش و جوان و رازاوەیە ..!!

## هەشتەم : ( دار المقامه ) ( جيگەی نيشتەجی ئارام ):

( خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿الَّذِي أَحَلَّنَا دَارَ الْمُقَامَةِ مِنْ فَضْلِهِ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ﴾فاطر ٣٥ . واتا: ئەو خويەی كە كەجينيشينی كردين لە مالی هەميشەيی دا بە بەخشش و ريزی تايبەتی خۆی ئيتر هيچ نەخۆشی و ناخۆشيەك توخنمان ناكەويت ،هيچ ئازارو ئيشيكی دەروونی تووشمان نابيت و هيچ بيزاری و ماندوو بوونيكيس روومان تيناكات ..!؟

## نۆيەم : (( المقام الامين ) ( جيگەی مانەوەی بی ترس ):

( خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ﴾الدخان ٥١ . واتا: لەو لاشەوە لە بەهەشتدا لەسايەی ميهرەبانی پەروەردگارا ،بەراستی ئەوانەی كە پاريزگارو ديندارن ،لەجيگەی و شوينيكی زۆر ئارامدا ژيان دەبەنەسەر ..!؟

## دەيەم : ( المقعد الصدق ) ( جيگەی راستی و راستگۆيان ):

( خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ (٥٤) فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِنْدَ مَلِيكٍ مُقْتَدِرٍ﴾ القمر ٥٤-٥٥ .واتا: بی گومان پاريگاران و خواناسان لەناخ يان نزيك رووبارو تاڤگەكاندا ژيانی پر لەبە ختياری وكامەرانی هەميشەيی دەبەنەسەر ..!! لەشوينی راست و راگۆيان يان پەسەندان لای خوای پاشای بالادە ستەوە ..!؟

## يانزەم : ( الغرفة ) ( ژووری رازاوەی بەرزە خۆشەكانی بەهەشت ):

( خوای گەورە ) دەفەرموويت : ﴿أُولَئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَامًا﴾الفرقان ٧٥ .واتا: ئەو جۆرە كەسانەی كە باس كران پاداشتيان ژوورە رازاوە و بەرزو خۆشەكانی بەهەشتە لەبەرامبەر خۆگرتن و ئارامگرتنيانەوە جا لەوی بە سلام كردن پيشوازيان ليدەكريت بۆ هەميشە دەحەوينەوە تيايدا ..!؟

## دوانزه : ( دار قرار ) ( شوێنی ئومید و حەسانەوەیە ):

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿يَا قَوْمِ إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ﴾ غافر ٣٩ .واتا: ئەی قەوم و هۆزەم بی گومان ژیانی ئەم دونیایە تەنها بریتیە لە رابوردنیکی کەم ، بەراستی ژیانی پاشە رۆژ و داهاتوو ، هەر ئەو شوینی ئومید و ئارام گرتن و حەسانەوەیە بۆئیمانداران ..؟!

## سیانزەم ( فیردوس )( شوینکی بەرزو بەلندە پر لە باغی جوان و دل رفینە )

( خوای گەورە ) دەفەرموویت:﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا﴾الکهف ١٠٧ . واتا: بەراستی ئەوانەی کەئیمان و باوەریان هیناوە و کردەوە چاکە کانیان ئەنجامداوە ، ئیمە هەر لە زووەوە بە بەهشتی فیردوسمان بۆ ئامادە کردوون تا لەوی دابەزن و ژیانی کامەرانی تیایدا بەبەنەسەر ..؟!

لە فەرموودەیەکدا ( عبادەکوری صامت ) بۆ مان دەگیریتەوە دەلیت پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( الجنة مائة درجة ، ما بين كل درجتين كما بين السماء والارض ،أعلاها الفردوس ، منها تفجر أنهار الجنة الاربعة ،فإذا سألتم فاسألوا الفردوس )) متفق عليه .واتە : بەهەشت (١٠٠) پلەیە دووری هەریەکیکیان لە یەکدا بەقەد دووری ئاسمانو زەویە لەیەکتر ،گەورە مەزن بەلندتریان باغەکانی ( فیردوسە ) هەر چوار رووبارەکانی بەهەشت هەر لەوی هەلدەقولین ، ئەوسا هەر کات ئیوە دواتان لە خوا کرد ،ئەوا دوای فیردوس بکەن ..؟!

# دەرگاکانی مالی نعیم

بەلی دەرگاکانی مالی نعیم هەشت دەرگایە لەدەرگانی مالی نعیم یان بەهەشت فریشتەکان دەچنەژوورەوە لە گەل کۆمەلی ئیمانداران ،هەریەکیك لەم دەرگایانەی بەهە شت چینك لە هەلگری سیفات خەسلەتی جوان ، هەریەکەیان بە کارو کردەوە چاکەکانی خۆی دەچینە ژوورەوە لەدەرگاکانی بەهەشت ، ئەوانەی کە ئەم کردەوە چاکانیان هەبووە لەژیانی دونیان بە کردەوەکانیان دەناسرین لەدەرگاکانی بەهەشت دەچنە ژوورەوە ،وە ك: دەرگای یەکخوا پەرستی دەرگای نویژ ، دەرگای جیهاد و دەرگای رۆژوو یان ( ریان ) دەرگای خیر صدقە ، دەرگای جیهاد و تیکۆشان ،یان دەرگای ئەو کەسەی کەدوو هاوسەری نفقە کردووە لە پیناوی خواد ،یان دەرگای زال بوون بەسەر توورەیی ،هەندیك لەزانایان دەرگای توبەشەیان لە بابی عبادەت و نویژو حج داناوە ، بەلی دەرگاکانی مالی نعیم بە پی کردەوەی لە ژیانی دونیا بۆ بەندە دیاری دەکریت هەر یەك و دەرگایەکی هەیە بەناوەی کردەوە چاکەکان بانگ دەکرین تەنها دەرگای ریان بۆ رۆژووان تایبەت کراوە،

هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿جَنَّاتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ الْأَبْوَابُ﴾ص ٥٠ .

واتا :باغەکانی بە هەشتی عدن ، کە هەر هەمووی دەرگاکانی لەسەر کراون بۆیان ..!!

هەروەك پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( الجنة لها ثمانية أبواب والنار لها سبعة أبواب )) . صحيح الالباني . واتە : بەهەشت هەشت دەرگای هەیە ، دۆزەخیش حەوت دەرگای هەیە ..!!

وە لە ( عمری کوری ختاب ) –خوا لی رازی بیت – لە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( مامنكم من احد يتوضا فيبلغ ( او فيسبغ ) الوضوء ،ثم يقول : أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا عبدالله ورسوله ،إلا فتحت له أبواب الجنة الثمانية يدخل من أيها شاء )).رواه مسلم برقم ( ٢٣٤ ) باب الطهارة.

واتە : هەرکەسیك لە ئیوە هەستیك دەست نویژیکی پاك و چاك بشوات ، وە شهادەی بهینی و بەلی ( اشهد أن لا إله إلا الله وان محمدا و رسوله ) ئیلا هەر هەشت دەرگای بەهەشتی لی دەکریتەوە ،لە هەریەکیکیان دەچیتە ژوورە وە بە دلی خۆی ..!!

وه له (ابی هریره ) وه – خوا لی رازی بیت – دەلیت پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت:

(( من أنفق زوجين في سبيل الله ، نودي من ابواب الجنة : يا عبدالله هذا خير ، فمن كان من أهل الصلاة دعى من باب الصلاة ،ومن كان من أهل الجهاد دعى من باب الجهاد ، ومن كان من أهل الصيام دعى من باب الريان ، ومن كان من أهل الصدقة دعى من باب الصدقة )). فقال (ابو بكر ) (رضي الله عنه ) : بأبي أنت وامي يار سول الله ما على من دعى من تلك الأبواب من ضروة ، فهل يدعى أحد من تلك الأبواب كلها ، قال : ((نعم وأرجو أن تكون منهم )). متف عليه .رواه البخاري برقم (١٨٩٧) كتاب صوم ،ومسلم برقم (١٠٢٧) كتاب الزكاة .واته : هەرکەسیك دووهاوسەر نفقه بکات ، بانگ دەکریت لە درگاکانی بەهەشت ،ئەی بەندی خوا ئەوا خیر هاتە ریگەت ،ئەوکەسەی کە ئەهلی نویژ بیت بەچاکی ئە نجامی بدات ،ئەوا بانگ دەکریت لەدەرگای نویژ کەران ،ئەوکەسەی لە ئەهلی جیهاد تی کۆشان بیت ئەوا بانگ دەکریت لەدەرگای جیهاد ،ئەوکەسەی لە ئەهلی رۆژووان بیت ،ئەوا لەدەرگای (ریان) بانگ دەکریت ،ئەوکەسە ی ئەهلی خیر صدقه بیت ئەوا لەدەرگای صدقه خیر بانگ دەکریتت ..!! (ابو بکر ) –خوا لی رازی بیت – فەرمووی : ئەی پیغەمبەری خو( صلی الله علیه وسلم ): سویند بە خوا هیچ زیانیکی بۆ کەس نیە لە هەر دەرگایەکەوە بانك بکری، ئایا کەس هەیە لە هەمووده‌رگاکان بانگ بکریت ، بەلی تکام وایە ئەتۆش یەکیك بی لەوان ..!!

هەروەها پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) پی راگەیاندوین ،ئەو کەسانەی کەبەبی حیساب دەچنە بەهەشتەوە ، بە تەنها بەدرەگا کانی بەهەشت تایبەت کراوە ، کە درگای دەست راستی بەهەشتە ، بەلام ئەوانەی تر دەمینەوەلە گەل ئومەتانی تر دا لە دەرگاکانی تر دەچنە ژوورەوە ،لە فەرموودەی شفاعەتدا،

هەروەك لەم فەرموودەیە دا هاتووە لە (ابی هریرە) –خوا لی رازی بیت – پیغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( فيقال : يا محمد أدخل الجنه من أمتك من لا حساب عليه من باب الايمن من أبواب الجنه ، و هم شركاء الناس فيما سوى ذلك من الابواب الاخر )). متف عليه . رواه البخاري ومسلم ،واحمد في مسند .

واتە: ئەی محمد هەر کەسیك لە ئوممەتی تۆ دا کە حیسابی لەسەر نیە ، لە دەرگاکانی بەهەشت بهینە ژوورە ،ئەوانەی هابەشی خەلکن لەدەرگاکانی دیکە ..!!

هەروەها پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) پێ راگەیاندوین کەوا دەرگاکانی بەهەشت چەندە گەورەو فراوان و پان بەرین وەلەم فەرموودەی سەروە دا هاتووە کەباسمان کرد فەرموودەی شفاعەت کردن بوو .

هەروەك لەم فەرموودەیە دا هاتووە لە ( ابی هریره ) –خوا لی رازی بیت – پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( فيقال : يا محمد أدخل الجنه من أمتك من لا حساب عليه من باب الايمن من أبواب الجنه ، و هم شركاء الناس فيما سوى ذلك من الابواب الاخر والذي نس محمد بيده !! إن بين المصراعين من مصاريع الجنة ، او ما بين عضادتي الباب ، كما بي مكة وهجر ، او كما بين مكة وبصرى )). متف عليه . رواه البخاري ومسلم ،واحمد في مسند . واتە : سویند بەخوایە ی کە نفسی منی بەدەست ،نیوان هەردوو دەگای بەهەشت وە کو نیوان مککه هجر ، یان نیوان مککه و بوصرا وایە .

هەروەها پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليەوسلم ) هەوالی ئەوەشی پی داوین کە دەرگاکانی بەهەشت لە رەمەزاندا دەکرینەوە ،هەروەك ئەفەرموودەیەکە لە (ابی هریر) – خوا لی رازی بیت – دەلیت :لە پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) : (( اذا دخل شهر رمضان فتحت ابواب السماء – وفي رواية – فتحت ابواب الجنة ووغلفت ابواب النار )).صحيحين في مسند احمد ،مشكاة المصابيح ١/٦١٢ .

واتە : لە رمانگی رەمەزان دەرگاکانی ئاسمان دەکرینەوە ،یان لەروایەتیکی تردا ، لە مانگی رەمەزان دەرگاکانی بەهەشت دە کرینەوە وە ،دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرین.

لەم فەرموودەیە دا هاتووە ، پیغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( إن ما بين المصراعين في الجنة مسيرة اربعين سنة ،يزاحم عليه كأزدحام الإبل وردت الخمس ظما )).سلسلة الاحاديث صحيحه .

واتە :نیوان دوو دەرگای بەهەشت ( ٤٠ ) سالە ریگایە ،زۆر قەلەبالغە دەبن خەلکیان تیدا تیك دەقژیی وەك ئەو ووشترانەی لەتینوایاندا دەچنە سەر ئاو ..؟!

## كليلى مالى نعيم

**يەكەم : يەكخواپەرستى (التوحيد ) : (لا إله إلا الله )**

پيغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموويت : (( فإن الله حرم على النار من قال : لا إله إلا الله ، يبتغي بذلك وجه الله )) واتە :هەركەسيك بە زارو بە دل بلى : لا إله إلا الله ،ئەوا (خواى گەورە ) ئاگرى دۆزەخى لە سەر حرام دەكات ..!!

هەروەها لە فەرموودەيەكى (ابو ذر خدري ) داهاتووە دەليت : پيغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووى : (( ما من عبد قال : لا اله إلا الله يم مات على ژلك إلا دخل الجنه ، قلت : وإن زنى وإن سرق ؟ قال : إن زنى وإن سرق ، قلت : وإن زنى وإن سرق ؟ قال : وإن زنى وإن سرق ، قلت وإن زنى وإن سرق ؟ قال وإن زنى وإن سرق على رغم أنف أبى دذر )). رواه البخاري . واتە : هەركەسيك لە بەندە بمريت پيش مردنى بلى (لا إله إلا الله ) ئەوا دەچيتە بەهەشتەوە ئەگەر زيناو دزيشى كردەبيت ..!!

**دووەم : (رازى بوونى خوا لە بەندەكەى ) (رضوان من الله )**

(خواى گەورە ) دەفەرموويت :﴿ وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ واتە: (خواى گەورە ) بەلينى داوە بەئيمانداران لە پياوان ئافرەتان ، بەوەى كە باغەكانى بەهەشتيان پى دەبەخشيت كە چەندەها رووبار بەژير درەختەكانيدا دەروات ، وجاريە بە بەردەم كۆشكەكانياندا ، هاورى لەگەل ژيانى هەميشەيى و نەبراوە تيايدا ،هەروەها چەندەها جيگەو ريگە و كۆشك و تەلارى خۆش و رازاوەى تايبەتى لەبەهەشت داو لە ناو باغى پر چرو پرى (عدن ) دا لەگەل رازى بوون و رەزامەندى (خواى گەورە ) لە هەموو نازو نيعمەتەكانبەنرخترو گرنگترە ،ئەوە خۆى سەرفرازيەكى زۆر گەورە و بى ئەندازەيە كە (خواى گەورە ) لە بەندەكەى رازى بيت ..!!

سی یەم : ( نوێژکردن لەمەزگەوت ) ( الصلاة جماعه ).

پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( لن يلج النار أحد صلى قبل طلوع الشمس وقبل غروبها – يعني الفجر والعصر – )). رواه مسلم . واتە : هەر کەسێك نوێژی بەیانی باکات پێش رۆژ هەلاتن نوێژی عصر بکات پێش خۆرئاوا بوون ، ئەوانە ناچیتەناو ئاگری دۆزەخەوە .

چوارەم : ( لا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم )

بەلی ئەمەش کلیکی بەهەشتە زۆر وتنەوەی ( لا حول ولا قوه الا بالله العلی العظيم ) لە بەر ئەوە گە نجینەی ژێر عەرشی پەروەردگارا ، ئەو زکرو نزاو پارانەوەیە ( ٧٠ ) جۆر لە جۆرەکانی بەلاو نصیبەت خەم پەژارە و نارەحتیت لەسەر هەلدەگریت ، بەو مەرجەی بە اخلاص و بە یەقینەوە بیت ..!!

پێنچەم : ( دامەزراوی ) ( استقامه )

بەلی ئەعرابیەك هاتە لای پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) شتێکم لە ئیسلامدا پی بلی کە ئێتر لەدوای تۆ لەکەسی تر پرسیار نەکەم پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) پی فەرموو : بلی باوەرم بە خوا هیناوە پاشان دامەزراوبە ) واتە : استقامه کارکرد بە پی باوەر و پرۆگرامی ئیسلام بیت ،استقامە هەبیت لەسەر ئەم پرۆگرامەبەنامەی کە بۆمان هاتووە ، هەروەك( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ﴾فصلت ٣٠ .

واتا: ئەوانەی بەراستی ووتیان : پروەردگارمان ( الله ) یە ،لەوەوداو بەردەوام پابەندی ئەو رێبازە راستە بوون ، ئەو لەسەرە مەرگ دەستە دەستە رێشتە دادەبەرزن ،بۆلایان پێیان دەلێن : هیچ ترس و بیمیکتان نەبەیت لەدا هاتوو دا هیچ غەم و پەژارەیەکتان نەبیت بۆ رابردوو ، مژدەتان لی بیت بە و بەهەشتە ی کە لە کاتی خۆی بەلینتان پی دەدرا ...!!

بی کلیلە کانی بەهەشت بۆ چوونەژوورە وە زۆرن بەلام ئەم پێنچ خالە بەشێك کن لە کلیکە کانی چوونەژوورەوەی بەهەشت و بە هەشتیان ..!!

## نازو نیعەمەتەکان و خۆشیە کانی مالی نعیم

### یەکەم : خواردن و خواردنەوەی  مالی نعیم :

بی گومان خواردن خورانەوە کانی بەهشت جۆ راو جۆرن ،ئەوەك لەم ئایە تانەی خوارەوە دا ئەم فەرموودانەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) کە هاتوون ، جا خواردن خوانەوە کانی مالی نعیم زۆرن وەك نان و گۆشت ، میوە و ،شیرینی و ، جۆرەکانی خورادنەوە ،وەکو  ئاو ، شیر ، هەنگوین ،شرابی خورانەوە ،لە بەهشت دا ، نە ئەو خورادنەوەی شربەی دونیا ، کە خورادنەوە کەی تیدا عقل و هۆشی لە دەست دەدات ،کە دەچیتە  ناو سکی جۆرەها نەخۆشی دروست دەکات ، وە ك نەخۆشی لاوازی بوونی کورچیلە کان جۆرە ها نەخشی تر ..؟! بی گومانە تەواو پیچەوانەی شەرابی دونیایە ..!! هەروەها ئەو خواردنانەی کە ناویان هاتووە یان ئەو خورادنەوانەی کە ناویان هاتووە ، کە خوا و پیغەمبەرکەی وسفیان کردووە ، تەنها بۆ ناسینیان یان بۆ زانینی ئەو هۆشی مرۆڤ لە دونیادا کە عەقلی بەسەر دا بشکیت بزانیت چۆنە ، ئەگینا لە سەرووی هەموو تصوریکە کەلە خۆشی لەزەت لی بینینی کە خوای گەورە لە خەلکی بەهشتی بەخشیەوە ، وەك جۆرەها میوە جۆورەها خواردنەوە جۆرەها گۆشت وە بالتدن  گۆشتی گا خواردنەوەی ئاو شیر هەنگوین و شەرابی  خەلکی بە هەشت ...هیتد

هەروەك ( خوای گەورە  )دەفەرموویت : ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِنْ مَاءٍ غَيْرِ آَسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِنْ لَبَنٍ لَمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِنْ خَمْرٍ لَذَّةٍ لِلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِنْ عَسَلٍ مُصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ﴾ **محمد** ١٥ .

واتا : وینەی ئەو بەهەشتەی کە بەلین دراوە بدریت بە خواناس پاریزگاران ،ئەمەیە چەندها رووباری لە ئاوی ساگارو تام نەگۆراوی تیدایە ، هەروەها چەندها رووباری شیر کە تامی نەگۆراوی تیدایە هەروەها چەندەها رووباری شەرابی تام خۆش و بۆنخۆشی تیدایە ، کە لە خواردنەوەی بیراز نابن  ولەبەر چایان ناکەویت ،بۆ ئەوانەی کە دیخۆنەوە چەندها رووباریك لە هەنگوین  پاکراوە مصفى کراوە بیگەردە ،هەروەها بۆیان هەیە لەبم بەهەشتەدا لە هەموو جۆرە بەرو بووم میوەیەکی جوان و بەتام  بخۆن ،هاو کات لەگەل لی خۆشبوون و خۆشەویستی  پەروەرگاریاندا ..؟!

(خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ يُطَافُ عَلَيْهِمْ بِصِحَافٍ مِنْ ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنْفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ وَأَنْتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ الزخرف ٧١ .

لەسەر سنی و کۆپی ئالتون جۆرەها خوراذن و خواردتەوەی جوان رازاوە وتام خۆش بۆن خۆشیان بەسەردا دەگێرن و لەو بەهەشتەدا هەرچی نەفس حەزی لی بکات و دل بیخوازیت و ژیانی هەمیشەیی و نەبراوەشی تیادا دەبەنەسەر ..!!

هەروەك ئە م فرموودەیەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە (جابری کوری عبدالله ) – خوالی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( يأكل أهل الجنه فيها و يشربون ،ولا يتغوطون ، ولا يمتخطون ، ولا يبولون ،ولكن طعامهم ذاك جشاء كرشح المسك يلهمون التسبيح والحمد كما تلهمون النفس )). رواه مسلم .

واتە : پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : بەردەوام بە هشتیوكان لە بەهشتا دەخۆن و دەخۆنەوە ، نەپیسایی دەکەن نەچلمیان هەیە و ، نەمیز دەکەن ، بە لکو پاشەرۆیی خورادنیان جۆرە ئارەقەیەکیە بۆنی هەر لەبۆنی میسك دەچیت ،سوپاس و ستایشی خوا دەکەن وەك چۆن ئیوە هەناسە دەدەن.

هەروەك (خوای گەورە) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ (٤١) وَفَوَاكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ (٤٢) كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾المرسلات ٤١-٤٣ .

واتا:لەولاشەوە بەراستی دیندارو پاریزکاران ،وان لەژێر سیبەردا، لە قال کانیاو تاڤگە کاندا ..!!لە هەر جۆرە میوەیەك کە ئارەزووی بکەن بۆیان ئامادەیە و پیشکەشیان دەکریت ..!! پیان دەووتریت بخۆن وبخۆنەوە ،حافیەتان بیت لە پاداشتی ئەو کارو کردەوە چاکانەدا کە ئە نجامتان دەدا ..!؟

هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ (٢٢) قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ (٢٣) كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ﴾ الحاقه ٢٢-٢٤ . واتا: لە بەهەشتی بەرزو بلندا (لە باخچەکانی سەر لووتەکەی چیاو لاپالی شاخەکاندا لە ناو کۆشك تەلارە کاندا ..!! میوە هاتی زۆر بە

درەختە کانیەوە شۆر بۆتەوەو لی کردنەوەی ئاسانەو لەدەستی راست دایە ..!! ئینجا پییان دەوتریت : بخۆن و بخۆنەوە حافیەتان بیت ،بەهۆی دەست پیشخەریتان لە رۆژگاری رابدوودا ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَأَمْدَدْنَاهُمْ بِفَاكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ﴾الطور٢٢.

واتا: بەردەوام حەزیان لە هەر میوە وکۆشتیك بیت پیشکەشیان دە کەین ..!؟

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَفَاكِهَةٍ مِمَّا يَتَخَيَّرُونَ (٢٠) وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ﴾الواقعە ٢٠-٢١ . واتا : میوەشیان بۆ دە گیرن بە ئارەزووی خۆیان هەلدەبژیرن ..!!گۆشتی هەر بالندەیەکیش کە حەزی لی بکەن بۆ تان ئامادەیە ..!؟

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿يُسْقَوْنَ مِنْ رَحِيقٍ مَخْتُومٍ (٢٥) خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ (٢٦) وَمِزَاجُهُ مِنْ تَسْنِيمٍ (٢٧) عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُونَ﴾المطففین ٢٥-٢٨ . واتا :شەرا بیکیان پیشکەش دە کریت کە پاك و سەر مۆرە..!! کە خواردیانەوە وەك بۆنی میسك ئەوناوە پرەکات ،(کە پیچەوانەی شەرابی دونیایە کە دە خۆنەوە دەروبەریش بۆ گەن دەکات ) جا با لە پینای ئەوەدا پیشبرکیکەران پیشبرکی بکەن ..!؟ هەروەها ئەو شرابە ئاوەکەی لە ( تسنیم )ە ..!؟شەرابی ( تسنیم ) یش سەرچاوە یەکە تەنها خۆشەویستان و نزیککراوەکان لیی دە خۆنەوە ..!؟

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِنْ كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا (٥) عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾الانسان ٥-٦. واتا: بی گومان چاکان و پاکانیش لە پەرداخیکی پر شەرابدا دخۆنەوە ، ئاویتەکەی لەسەر چاوەی کافوورەوەیە ..!! کە کانیەکە بەندەکانی خوا لی دە خۆنەوە لە هەر شوینیکدا بیانەویت هەلی دەقولینن وفوارە دەکات ..!؟

هەروەها لەفەرموودەیەکی پیغەمبەری (خوا صلى الله عليه ) فەرموویەتی : (( إن طير الجنة كأمثال البخت ، ترعى في شجر الجنة )). فقال أبو بكر (رضي الله عنه ) : يا رسول الله ! إن هذه الطير ناعمة . فقال أكلتها أنعم منها (قالها ثلاثا ) وإني لأجرو أن تكون ممن ياكل منها )).اخرجه في مسند احمد ٣/٢٢١.

واتە : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : باڵندە یەك لە بەهەشت دا تروات بە سەر درختە کاندا ، وەکو (البخت ) وایە ، واتە: وەك ووشتری خۆرسانی گەورەیە ، (ابو بکر ) – خوالی رازی بیت ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) : ئایا نعامەیە ؟! فەرمووی : بەڵی . ئەم دە خۆن . سی جا ئەمەی دووبارە کردەوە، ووتی : تکادەکەم ئیوەش لە و کەسانە بن کە ئەمە بخۆن ..؟!

هەروەها (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنْجَبِيلًا﴾الانسان ١٧ .

واتا: هەروەها شەرابیکی تریان پیشکەش دەکریت کە ئاویتەی زنجەبیلە . مەگەر (خوای گەورە ) بە خۆی بزانیت (زنجبیلا ) چیە چەندە خواردنەوەیەکی خۆش و بەلە زەت و بەتامە ..؟!

بەلی یەکەم خواردنی بەهەشت یان مالی نعیم خورادنی جگەری حووتە یان جگەری نەهەنگە لە زیادەکەی جگەری حووت یان نەهەنگ .

وەلە صحیح بوخاری دا هاتووە لە یەکەم پرسیاری لە شاری مەدینە دا کرا دەربارەی مالی نعیم خواردنی مالی ، ئەوە (عبداللە ی کوری سلام ) ئەم پر سیارەی لە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) کرد ، ووتی : یەکەم شت یان خورادنی کە بە هەشیە کان دەی خۆن چیە ؟ پیغەمبەری خوا فەرمووی : (( زيادە كبد الحوت )) . واتە زیادەی جگەری نەهەنگ یان حووت .صحيح البخاري برقم (٣٩٣٨).

هەروەها لە صحیحی مسلم دا هاتووە، جوولەکەیە پرسیار لە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەکات ، دەلیت : (( فما تحفت حين يدخلون الجنه . قال : (( زيادە الكبد الحوت )).

قال : (( فما غذاؤهم على إثرها ؟! قال : ينحر لهم ثور الجنة الذي يأكل من اطرافها ))

قال : ((فما شربهم عليه )) ؟! قال : من عين تسمى سلسبيلا ) قال : ((صدقت )). صحيح مسلم برقم ٣١٥.

واتە : جوولەکەیە یەك لە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) پرسی : کە بەهەشتی دەچنە بەهەشت یەکەم دیاری پیشوازیان چیە ؟! پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( زيادە كبد الحوت )) واتە : زیادەی جگەری حوت یان نەهەنگە . پاشان ووتی : ئەی لە پاش ئەمە چی دەخۆن ؟! فەرمووی: گای بەهەشتیان بۆ سەر دەبرن لە میرگە کانیان لەوەرگاکانی بەهەشتو دەوروبەرید ا دەلەوەرین .

ووتی : ئەی پاشان چی بەسەر دادەخۆنەوە ؟! فەرمووی : لە کانیاویك کە ناوی ( سلسبیلا )

جوولە کە کە ووتی : راست دەکەیت .

هەرەها لە ( ابو سعید خدری ) – خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( تكون الارض يوم القيامة خبزة واحدة ، يتكفؤها الجبار بيده ، كما يتكفا احدكم خبزته في السفر نزولا لأهل الجنة ،فاتى رجل من اليهود فقال : بارك الرحمن عليك يا أباالقاسم ،الا أخبر بنزل أهل الجنة يوم القيامة ؟! قال : ( بلى ) .قال :تكون الارض خبزة واحدة ... كما قال النبي ( صلى الله عليه وسلم ) فنظر النبي ( صلى الله عليه وسلم ) إلينا ،ثم ضحك حتى بدت نواخذ ثم قال : الا اخبرك بإدامهم ؟! بالام والنو . قالوا و ماهذا ؟! قال : ثور ونون ياكل من زائدة كبدها سبعون ألفا )).متفق عليه رواه البخاري برقم ( ٦٥٣ ).

واتە : لەرۆژی قیاتە دا زەویە دە بیت یەك نان ،وە ك چوۆن یەکیك لە ئیوە لە سەفر دا نانی لە دەستتان دە گیری ئاوا خوادی خاوەن دەسەلات بەدەستی خۆی ئەم دەست ئەم دەستی پی دەکات تا بکریتەوە بۆ ئەهلی بە هەشت حازربی .. جوولەکەکە ووتی ) ( بارك الرحمن ) یا باوکی القاسم ، ئایا هەوالی ئەلی بەهەشت لەرۆژی قیامەت دا ؟! پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی ( بەلی ). زەوی دەبیت بە یەك نان ، پاشان پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) تەماشای کرد ، هەروەها پیکەنی هەتا ددانەکانی دیار کەوت ، هەروەها فەرمووی : هەوالی دەربرینی ( بالام والنون ) بە ووتەی : عبرانی واتە :گا ، واتە : گاو زیادەی جگەری حوت ( ٧٠ ) هەزار کەس لی دە خوات ..؟!

## دووەم : شەرابی یان مەی خورادنەوەی مالی نعیم :

**بەلی بی گومان یەکیك لەو خواردنەوانەی کەبە ئەهلی مالی نعیم دەبەخشیت ئەوەیش خوادنەوەی مەی یان شرابە ، کە چیاوازە لەشەرابی دونیا ، تەنها ( خوای گەورە ) دە زانیت چەدن بە لە زەتە بۆ بەندە صالح و چاکە کارەکانی دانەوە و پییانی دەبەخشیت لە بەهەشت دا ، بەلی شەرابی بەهەشت هیچ وەك شەرابی دونیا نیە کە بیرو هۆش و عەقل لە دەست بدەیت ، کە سەران پر ژان و ئیش ئازار دەکات ،جستەو لاشە ناخۆ دەکات ، بەلی شەرابی دونیا نا تەندروستە بۆ ریخۆلەکان گورچیلە کان لە کار دەکات ، بەلام شەرابی بەهەشت شەرابیکی زۆر پاك وبیگەرو صافە ، هیچ عیب و عاریکی تیدانیە ،شەرابیکی جوان بیگەردە هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنْجَبِيلًا (١٧) عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّى سَلْسَبِيلًا﴾ **الانسان ١٧-١٨ . واتا: هەروەها شەربیکی تر پیشکەش دەکریت کە ئاویتەکە ی ( زنجبیلا ) ..؟! کە سەرچاوەی ئەم شەرابە لە بەهشتیکە لە ( سلسبیلا ) سەر چاوە دە گریت .؟!**

**هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿يُطَافُ عَلَيْهِمْ بِكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ (٤٥) بَيْضَاءَ لَذَّةٍ لِلشَّارِبِينَ (٤٦) لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنْزَفُونَ﴾**الصافات ٤٥-٤٧ ؛**

**واتا: لە بەرداخی تایبەتدا شەرابی تایبەتیان بەسەردا دەگیرن ..!!شرابە کە زۆر سپی و بەلەزەتە بۆ ئەکەسانەی کە دەی خۆنەوە و نۆشی دەکەن ..!!ئەو شەرابە نە دەبیتە هۆی سەر ئیشەو خاو بوونەوە ، نەبەست و سەرخۆش و بی هۆشیان دەکات ، وەك شەرابە نا پوختەکانی دونیا ..؟!**

**هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :**﴿ وَأَنْهَارٌ مِنْ خَمْرٍ لَذَّةٍ لِلشَّارِبِينَ﴾**محمد ١٥ .**

**واتا: چەندەها رووباری شەرابی تام خۆش و بۆنخۆشی تیدایە ، کە لە خواردنەوەی بیزاز نابن ولەبەر چایان ناکەویت..!! بەلی بیگومان ووشەی شەراب یان خواردنەوە یان ( خمر ) لە قورئان دا هاتووە بە مانیە دیت کە ئەو کە سانەی لە خەلکی بەهشت خۆشی لەزت و متاعی لی دەبینین وە نیعە تیکی زۆر گەورەو عظیم و خۆشە ،بەلام ( خوای گەورە ) ئەم شەرابە پیسە ی دونیایی حرام کردووە ،لەبەر چەند هۆکایك کە مرۆڤ تووشی هیلاکەت مال ویرانی بی هۆشی بی عەقلی دەکات ،هەروەها سزایی بۆ ئەو کەسانە داناوە کە شەراب یان مەی دونیا دە خۆنەوە ئەو کەسی دەی خوات لە دونیادا ٤٠ جلەدەی لیدەدریت ، لە قیامەتیش ئاوی حمیمی پی دەدریت کە ئاویکی کولاوی جەرگ برینە ،چوکە مرۆڤ بە هاو سنەگی خۆیە هەی نابیت عەقل وهۆشی خۆی لەدەست بدات لە ژیانی دونیادا ،کاتیك عەقل نەما وە ئاژەلی لی دیت**

،هەر بۆیە ( خوای گەورە ) حەرامی کردووە، هەروەها ئەو کەسە لە دونیادا دیخواتە وە ،ئەو سزایی وەردەگریت لە قیامەتدا ،وە ئەو شەرابەی یان ئەو خوادرنەوەی کە بۆ ئەهلی بەهشە ت دانراوە لی حرام دەکریت ، کە خواردنەوەیەکی زۆر پاك بیگەردە هیچ کەم کوریەکی تیدانیە ، وە لە کۆشکەکانی بە هەشت بە شیوەی رووبار دیتە خوارەوە ، هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ (١٨) لَا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنْزِفُونَ﴾الواقعە ١٨-١٩ .واتە : بە کۆپ دۆلکەوسوراخی دەگەرین ولە بەرداخی تایبەت جۆرەها شەربەت و خورادنەوەی بەتام و خۆشیان پیشکەش دەکەن کەلەسەرچاویە کی رەوانەوە پر دەکرین ..!! ئەو مەی یان شرابە نە نەسەریان پی دیتە ئیش وە نەسەر خۆش دەبن ..؟!

بەلی ( ابن کثیر ) لە مانایی ئەم ئایە تەدا دەلی : ئەم شەرابە نەوەیە سەر دەئیشی نەو نەئەوەیە بی هۆش مەست سەر خۆشت دەکات ، بەلکو خواردنەوەیەکی زۆر پاك وبیگەردە لە گەل زۆری لەزەت خۆشی تیدا ..!!هەروەکو شەرابی دونیا پرە لە پیسی ناپووختی و بۆگەنی و بی خۆشی هەروەها عەقل لەدەست دان .!!

هەروەك ( خوای گەورە ) دەفرموویت : ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ﴾ الانفطار ١٣ . واتە : سەر ئە نجام بەراستی چاکەکاران ، خواناسان لە ناو نازو نیعمەتدا ژیانی پر لە شادی و خۆشی دەبەنەسەر ..!!

هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنْجَبِيلًا (١٧) عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّى سَلْسَبِيلًا﴾الانسان ١٧-١٨ . بەلی شەرابی بەهەشت بە دوو جۆر پیشکەش دەکریت : جاریك بە ( کافور ) و ە جاریك بە ( زنجبیل ) پیشکەش دەکریت ، هەروەك ( کافور ) ساردە ( زنجبیل ) گەرمە ، چونکەخورادنەوەی زۆر بە تام بە چیژە بۆنیکی زۆر خۆشی هەیە ..!! خورادنەوەی ( السلسبیل ) ئەویش خورادنەوەیەکی زۆربەتام بە چیژە .

هەروەها ( عبداللە ) – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (( إن الرجل من أهل الجنة ليؤتي بالكاس و هو جالس مع زوجته فيشربها ثن يلتفت إلى زوجته فيقول : قد ازددت في عيني سبعين ضعفا حسنا )). اخرجه : ابن أبي شيبة في مصنفه ،باسناد صحيح . واتە : پیاویك لە ئەهلی بەهەشت دا بەدراخیك لەدستە لە گەل دانیشتووە لە گەل هاوسەرەکە بەدەروی سەریەوە دەسووریت تەماشای دەکات ، دەلیت :هیشتان بۆ م زیاد دەکەیت لە م شەرابە کەچاوەکان ( ٧٠ ) هیندە باشن چاکن ..!!

## سی یەم : خواردن و خوانەوەی بەهەشت لە لاشەی مرۆڤ دا بۆ کیو ئەچی ؟!

ئەی براو خوشکی بەریز رەنگە بە خەیال مان دابیت  خواردن خوانەوەی مالی نعیم یان بەهەشت هەمان خواردن خواردنەوەی ژیانی دونیایە ، کە دەی خۆین هەرسیان دەکەین ..؟! نە خیر وانیە کەبیری لیدەکەینەوە لە روویی جستەی مرۆڤەکان لەبەهەشتدا ، ئیمە لە دونیادا خواردن دە خۆین دواتر دەبیتە پاشەرۆ لەدواوە یان لە پیشەوەی جستەی مرۆڤ فریدەدری ، پیسایی یان میز لەدوای خواردن هەس کردن فری دەدریت ، بەلام ریك لە بەرهەشت ئە کرداوە پیچەوانەیە نابیت مرۆڤ پیسایی یان میزی هەبیت چونکە مالی نعیم شوینکی پاکە دەبیت مرۆڤی پاك بیگەرد لەم مالە دا بۆ هەمیشەیی بە پاکی و بی گەردی ژیان بکات ، بی گومان ناگونجیت بەهەشتی ( خوای گەورە ) کەم کوری تیدا بیت و ، هەروەك لە ( ابو هريره ) وە – خوا لی رازی بیت – دەفەرموویت : (( أول  زمرة تلج صورتهم علي صورة القمر ليلة البدر ، لايبصقون فيها ولا  يمتخطون ولا يبزقون )) رواه البخاري كتاب بدة خلق باب ماء جاء في صفة الجنة  فتح الباري ٣١٧/٦. واتە :یەکە م پیر کە دچنە بەهەشت وینەیان وە ك مانگی ١٤ وایە یان مانگی تابان ،نە تفی تی دەکەن و نەجلمی لی دەریژن ..؟!

هەروەها لە صحیحی مسلم دا هاتووە لە ( جابری کوی عبدالله ) – خوا لی رازی بیت – دە لیت : پیغەمبەری خوا ( صلی الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( يأكل أهل الجنة فيها ويشربون ، ولا يتغوطون ، ولا يمتخطون ، ولا يبولون ، ولكن طعامهم ذاك جشاء كرشح المسك يلهمون التسبيح والحمد كما تلهمون النفس )). رواه مسلم برقم ( ٧٠٨٣ ).

واتە : خەلکی بەهەشت لە بەهەشتا شت دەخۆن و شت دەخۆنەوە، بەلام نە پیسایی دەکەن نەچلم و کلمیان هەیەو ، نەمیز دەکەن و نە پاشەرۆ سەر ئاو  دەکەن ، ئەو خورادنەوە کە دیخۆنەوە ، وەك بۆنی میسك دەبیت ،وە بەئارەقە لە لەشیان  نم نم دیتە دەروە ، ئەو خورادمەنیەش کە دەی خۆ بە قرقینەی بۆنخۆشی وەك گولاو دەراوات ، وە ك چۆن لەبەهە شتا بە ئاسایی و بە ئاسانی و بەخۆشی ، بەبی ئەرك وزەحمەت هەتاسە دەدەن ، ئاوە هاش لە خوداوە  یاد و زیکری دەکەن ، بەتایبەتی یادی ( سبحان الله ) و ( الحمد الله ) ..؟!

## چوارەم : ئاژەل و باڵندەکانی ماڵی نعیم

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ﴾ الواقعه ٢١ . واتا: گوشتی هه ر باڵده یەکیش کە حەزی لی بکەن بۆتان ئامادەیە ..!!

هەروەها لەفەرموودەیەکی پیغەمبەری ( خوا صلی الله علیه ) فەرموویەتی : (( إن طير الجنة كأمثال البخت ، ترعى في شجر الجنة )). فقال أبو بكر ( رضي الله عنه ) : يا رسول الله ! إن هذه الطير ناعمة . فقال أكلتها أنعم منها ( قالها ثلاثا ) وإني لأجرو أن تكون ممن ياكل منها )).اخرجه في مسند احمد ٢٢١/٣.

واته : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : باڵندە یەك لە بەهەشت دا تروات بە سەر درختە کاندا ، وەکو ( البخت ) وایە ، واتە: وەك ووشتری خۆرسانی گەورەیە ، (ابو بكر ) – خوالی رازی بیت ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) : ئایا نعامەیە ؟! فەرمووی : بەلی . ئەم دە خۆن . سی جا ئەمەی دووبارە کردەوە، ووتی : تکادەکەم ئیوەش لە و کەسانە بن کە ئەمە بخۆن ..؟!

وە لە ( ئەنسی وری مالیك)وە – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پرسیاریان لە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) : (( ما الكوثر ؟! قال : ذاك نهر اعطانيه الله – يعني : في الجنة –أشد بياض من اللبن ، وأحلى من العسل ، فيها طير أعنقها كأ عناق الجزر )). قال عمر : أن هذه لناعمة ، قال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) (( اكلتها أنعم منها )). رواه الترمذي حديث حسن .

واته : لە پیغەمبەری خوا یان پرسی ( صلی الله علیه وسلم ) : دەربارەی حەوزی کەوسەر چیە ؟! ئەویش فەرمووی : رووباریکە ( خوای گەورە ) لە بەهەشتدا پیم دەبەخشیت ! ئاوە کەس لەشیر سپی ترە ، وە لە هەنگوین شیرن ترە ،باڵندەی تیدایە میلی وەك ملی ووشترە ، عمری کوری ختاب – خوا لی رازی بیت - فەرمووی : ئەو باڵندانە لە خۆش گوزەرانیدان واتە: نعامە پیغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : ( بخۆرەکانیش لەوان خۆشگوزەرانترن ..؟!

هەروەها دەربارەی ئاژەڵەکانی مالی نعیم  ئەم فەرموودەیەی  پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتووە ، بەلام فەرموودەکە بە (ضعيفه) لە مسندي الترمذي دا هاتووە  ، لە (سلیمانی کوریی بريده لە باو کیەوە) دەلیت : (( أن رجل سال النبي (صلى الله عليه وسلم) فقال : يا رسول الله ، هل في الجنة من خيل ..؟! قال : إن الله أدخلك الجنة ، فلا تشاء أن تحمل فيها على فرس من ياقوتة حمراء يطير بك في الجنة حيث شئت إلا فعلت قال : وساله رجل فقال: يا رسول الله ،هل في الجنة من إبل ..؟! قال : يقل له ماقال لصاحبه قال : إن يدخلك الله الجنة يكن لك فيها ما اشتهت نفسك ولذت عينك ..!! )). اخرجه التر مذي برقم (٢٥٤٣).

واتە: پیاویك پرسیاری کرد لە  پیغەمبەریخوا (صلى الله عليه وسلم) ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە بەهەشتدا ئەسپ ولاخی بەرز هەیە ..؟! ئەویش فەرمووی : ئەگەر خوای گەورە تۆ بردە بە هەشتەوە ، ئەگەر ئارەزوو بکەی سواری ئەسپی بالدار دەبی ..!! بالە کانی لە یاقووتی سور و ئال درەست کراوە ، بۆ هەر کویی ئارەزوو بکەیت بال دەگریت  و دەتبات بۆ ئەو شوینە ..!! پیاویکی تر پرسیاری لی کرد ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە بەهشتدا ووشتر هەیە ..؟! بەلام وەك پیاوەکەی پیشوو نەی فەرموو : ئەگەر خوای گەورە تۆی بردە بە هەشتەوە ، هەمووشتی بەدلی تۆیە هەرچی نفست ئارەزووی بکان وە چاوەکانت لەزەت و خۆشی لی وەرگرن بۆت دەستەبەر دەکری ..؟!!

هەروەها لە (ابی مسعودی ئەنصاری)دەلیت : (( جاء رجل بناقة مخطومة ،فقال : هذه في سبيل الله ، فقال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) : (( لك بها يوم القيامة سبع مائة ناقة كلها مخطومة )). صحيح مسلم برقم (١٨٩٢). واتە : پیاویك هات بۆ لای پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ووشتریکی مۆرکراوی هینا ووتی لە پیناوی خوایە ، پیغەمبەری خوا فەرمووی : لەرۆژی قیامەت دا ٧٠٠ ووشتر پی دەدریت هەر هەموویان مۆرکراون ..!!

## پێنچەم :لە مالی نعیم نووستن نیە.. سەرقالی لەزەتی بەهەشتی

لە ( جابری کور عبدالله ) و لە ( عبداللەی کور ابی اوفی ) – خوا لیان رازی بیت – دەلین : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویە تی : (( والنوم أخوت الموت ،ولا ینام أهل الجنه )). ابو نعیم فی حلیه ، الالبانی فی سلسلة الاحادیث . واته :خەو بر ای مردنه ، لە بەهەشت دا خەوتن نیە ..؟!

بی گومان ئەوەش نیعەتیکی گەورەو زۆر عظیمه کە ئیماندار لە بەهشت دا پی دە بەخشریت ، و بە تصورەی هەموو کەسیك کە بیر بکاتەوە لە نازو نیعمەتەکانی بەهە شت دا کە خوای گەورە پی بەخشیون لەبەهەشتی دا ئەوەیش خۆش ی لە زەت وەرگرتنە ، هیچ کات ئیماندار یان ئەهلی بەهەشت ماندوو نابن تاو بحەسینەو ە بۆ خەوتن ، بەردەوام هەمیشە بە خۆشی شادی رادەبورین لە بەهەشتدا چونکە نیعەتیکی نەبراوەیە بۆ هەمیشەیە ، هیچ دابرانیك تیدانیە لە هەموو ساتەکانی ژیان لە بەهشتدا کە تیدا دەژی تەنها بەختەوەری خۆشی شادی بەسەر دەبیت ، بۆ یە خەوتن لە کاتیك دا دەبیت کە مرۆڤ بحەسیتەوە میشکی لە ماندی بوون ، بەلام لە بەهەشتدا نەماندی دەبیت نە غەم و پەژارەت هەیە هەر بۆیە کە چۆن مردن نیە ئاواش خەوتن نیە ،هیچ سەعاتیك یان چرکەساتیك بەسەر نیە بی خۆشی شادی نیعەتەکانی بەهشت کەواتە هەموو کات و ساتیك پرە لە نازونیعمەت هەر بۆیە بەندی ئیماندار ئەهلی بەهەشت هیچ چرکەساتیك نیە تی نەپەریت بەبی نعیم یان بە بی بەختەوەری خۆشی شاردی لەزەتی بەهشت هەمووکاتیك لەزەت خۆشی شادی دەبەیتەسەر ،واتە ئەگەر خەوتن هەبیت ئەکەتە نعمەتی بەهەشت پرانی لی پەیدا دەبیت هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ سُعِدُوا فَفِي الْجَنَّةِ خَالِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ إِلَّا مَا شَاءَ رَبُّكَ عَطَاءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾هود ١٠٨. واتا: ئەوانەش کە کامران بەختیار کراون ئەوە لە بەهەشتدان بۆ هەتاهەتایی تیایدا دەمینەوە هەتا ئاسمانە کان وە زەوی هەبیت کە ئەویش بۆ هەتا هەتایی دروست کراوە لە قیامەتدا ،ئەمەش بەخششیکە هەر گیز کۆتایی نایەت ..!!ووشەی ﴿مَجْذُوذٍ﴾ واتای : کۆتایی نایەتی نازو نیعەتەکانی بەهەشت یان هیچ کات پرانیان نیە ..؟!

بی گومان مالی نعیم بەختەوەری شادی خۆشی سەرقالی لەزەتی خۆش زۆر تیدایە چەنکە بە بەراودر لە دونیا چەندەها جار خاوەنی هەموو مولکی ژیانی دونیایی هەر بۆ یە زۆر مشغول سەرقالی بە خۆشیەکانی بەهەشت ..؟!

با نموونیەکی زۆر بەسیتی ژیانی دونیا بینین ،ئەوانەی پاشاو سەرکردەو بازرگان و فەرمانرەوەان بۆ میلەتەکەیان چەندە سەرقال و مشغول پر لە کار ئیش کاتی ئەوە یانیە بخەوەن ، کە بە هۆی ئیش کارو سەقالی ژیانی دونیا کەچی زۆر کوتە و تەمەنیکی زۆر کەم بەسەر دەبەن ، ئەلین : ئیمە کاتی خوتنمان کەم ، کەچی ئەگە ر بەلین (١٠) جار خاوەنی هەموو مولکی دونیا بیت چۆن تواناى ساتیکی خەوتنی ، بی گومان نەخیر ، ئەی ئەگەر بەراوردی نازو نیعەتەکانی بەهەشت بکەین دەبیت چەندە بەختەوەری خۆشی شادی سەرقالی خۆشەی کان نازو نعیمەتەکانی بەهشت بیت ، هەر بۆیە زساتر مشغول سەرقال دەبین ، خەوتنیش نیە ..!! هەروك (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَاكِهُونَ (٥٥) هُمْ وَأَزْوَاجُهُمْ فِي ظِلَالٍ عَلَى الْأَرَائِكِ مُتَّكِئُونَ﴾ يس ٥٥-٥٦ .

واتا : بەراستی ئەمرۆ بەهەشتیەکان لە ناو خۆشی و شاردی و کامەرانیەکی بی وینە دا مشغول و سەرقالن ..!! خۆیان هاوسەرەکانیا لەژیر سیبەری درەختی جوانو چرو پردا لەسەر کورسی و قەنەفە رازاوەکان شنیان داداوە ..!!

بەلی بە سەر بردنی کاتیکی خۆش لە لەزەت وەرگرتن لەو هەموو خۆشیە کە هەیەلە بەهشتدا وەك بەسەر بەردنی لەگەل هاوسەرەکانیان لەسیبەری دەرختەکانی بەهشەتە یان لەگل حوری عین یان حوری چاو گەشە گاندا ئەمانە هەر هەمووی ﴿إِنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَاكِهُونَ﴾ و هەروك پاشایکی کە خاوەنی ملك زەوی زۆر بیت ، کە (خوای گەورە ) بەخۆی دەزانیت چەندە مولك کۆشك و چادرو خیوت لەزەتی خۆشی بەخشیوە بە بەندەئیمانداەرەکەی خۆی ، جا کەی کاتی ئەوەی هەیە بخەویت ..؟!

هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەر موویت : ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا﴾الانسان ٢٠ .

واتا : کاتیکش بە هەر لایەکدا چاو دەگیریت ، ئەوا نازونیعەتی نەبراوە بی ئەندازە و دەسەلاتیکی گەورە دەبینیت لە باخ باخات وکۆشك تەلاری جوان رزاوە و دیمەنی دلەفەرین بی سنوور ..!!

## شەشەم : ئایا بەراورد دەکریت  لە نیوان مالی دونیا مالی نعیم دا..؟!

بی گومان بەراورد ناکریت هەر گیز ..!! تاوانین بەلین نعیم دونیا ، چونکە رابواردن یان متاعی دونیا نەك نعیم دونیا هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەروویت : ﴿مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ لِمَنِ اتَّقَى وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا﴾النساء ٧٧. واتا: بەوانە (بلی ) : رابراونی ژیانی زۆر کەم زۆر کورتە ، ژیانی قیامەت یان نیعم بەهەشت چاکترو خۆشترو نەبراوەیە بۆ ئەو کەسەی لە خوا دەترسیت و پاریزکارە ، لەوی بە قەدەر تالی ناوکی خورمایەك ستەمیان لنارکریت ..!!

بەلی دونیا بە گشتی مالی تاقی کردنەو  امتحان ابتلاء ، مالی بەختەوەری نیە ، هەروەکو ( خوای گەورە ) دورستی کردووین بۆ تاقی کردنەوەی بەگەین بە ویسگەی مالی قرار یان مالی حیساب ولی پیچینەوە یان ئەو بەهەشتە ی کە بۆ ئیمەی ئیمانداری راستەقینە ئامادەی کردووە ،بۆئەوەی بەختەوەری لەویدا بەدەست بینین بۆ هەمیشەیی هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەروویت : ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾الملك ٢ . واتا: هەر ئەو خۆی ئەو مردن ژیانەی کە بەدیهیناوە ، بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە ، کام تان کردەوەی چاکترو باشترو پەسەندترە ، هەر ئەویش زاتیکی بالادەستە بەسەر بی باوەراندا ، وەلیخۆشبووە لە ئیمانداران ..!!

بەلی زۆر لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزە هاتووە کە مالی دونیا جیگای تاقی کردنەوە امتحان و ابتلاء ، بۆ هەر مرۆڤیك و ئیمانداریك کە کارو کردەوەی چاك ئە نجام بدات ، هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەر مووێت : ﴿تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الْآخِرَةَ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾لانفال ٦٧ .

واتا: مەگەر دونیاتان دەوەیت بەدەمووشت ومەتەکانی ؟! لە کاتیك دا خوای گەورە  ئەو جیهانەی دەویت و قیامەت رۆژی الاخرە  مەبەستە ، خوا بالادەست و دانایە  سەرکەوتن بە ئیمانداران دەبەخشیت و دانایە لە تاقی کردنەوە یاندا ..!! هەروەك ئەفەرمووودەیە  پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە ( ابو هريره ) وە – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا فەرموویەتی : (( موضع سوط في الجنة خير من الدنيا وما فيها )). رواه البخاري  ، ومسلم في مشكاة المصابيح ورقم الحديث ٥٦١٣ . واتە : وشوینی جیگای قامچیە کی بەهشت باشترە و خیر ترە لە هەموو ژیان و ملکی دونیا ..!!

## حەوتەم : پۆشاکی یان جل وبەرگی مالی نعیم

بی گومان لە ژیانی دونیادا پۆشاك و جل وبەرگ ، بۆ دەرکەوتنی جوانی مرۆڤە کە ریك وپیکی جوانی دەرووی دەردەخات ،هەروەك رەنگینی جل بەرگ و پۆشاك زوق و چیژ دەبەخشیت بە کەسەکە وە زۆربەی خەلك حەزو ئارەزووی لە جوانی و ریك و پیکیە پەرە بە رازاندنەوەی خۆی دە دات بە جۆرەکا پۆشاك و جل بەرگ ، بەتایبەتی ئافرەتان جوانی خۆیان درە دەخەن بە جل بەرگ و پۆشاك ، زیاتر لە پیاوان ئارە زوویان لی یەتی ، هەروەك ( خوای گەورە ) بۆ تاقی کردنەوەی مالی نعیم هەجدند جۆریکی رازانەوەی لە پیاوان قەدەغەکردووە وەك پۆشاکی حریر یان زیر نابیت بۆ خۆ جوان کردن و رازنەوە لەبەر بکریت لە پیاواندا قەدەغەی کردووە ، بەلام بۆ ئافرەتان ئازاد کردووە حەلا لی کردوە ، هەروەك ( خوای گەورە ) دفەرموویت : ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا (٣٠) أُولَئِكَ لَهُمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِنْ ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِنْ سُنْدُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الْأَرَائِكِ نِعْمَ الثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا﴾الکهف ٣٠-٣١ . واتا: لە لاشەوە بۆ ئەوانەی کەبەراستی ئیمان و باوەریان هیناوە و کارو کردەوەی چاکەیان ئەنجامداوە ، با دلینابن ئیمە پادشتی ئەوکەسە بەرزایە نادەین کە کردارو رەفتاری جوان و پەسەندە ..!! ئا ئەوانە باخەکانی بەهەشتی ( عدن ) بۆیان ئامادەیە کەچەندەها رووبار بەبەردەمیاندا جاری و روانە ، بازن دەست بەندو ( سەعاتی ) ئالتونیان لەدەست دە کریت ،جل و پۆشاکی سەوز یان کەسك و جوان دەپۆشن کە دووچینە ،چینی ژیرەوە ئاورشمی ئەستوورە چینی سەرەوە ئاورشمی تەنکە ،جا بە کەمالی شادیەوە لەسەر کورسی قەنەفە رازاوەکان شانیان داداوە ،بەراستی ئەو بەختەوەرانە چاکترین و جوان ترین خۆشترین پاداشتیان دەستکەو تووە ، هاوری لەگەل خۆشترین و سازگارترین جیگەو ریگە دا ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ اللَّهَ يُدْخِلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِنْ ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ﴾الحج٢٣. واتا :بەراستی خوا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هیناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە دەخاتە ناو باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها رووبار بەژێر درەختە کانیکدا و بەبەردەم کۆشکە کانیدا جار و رەوانە ، دەستیان دەرازێنریتەوە بە بازنی ئالتوون و مراواری لە شێوەی سەعاتی دەست هەر جۆریك دا کە حەزری لی بکەن ، پۆشکیشیان لەو بەهەشتدا ئاورشمی جوان و نایاب و هەرمەرەنگە..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ (٥١) فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ (٥٢) يَلْبَسُونَ مِنْ سُنْدُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُتَقَابِلِينَ﴾الدخان ٥١-٥٣ . واتا : لەو لاشەوە لە بەهەشتدا لە سایەی میهرەبانی پەروەردگارا : بەراستی ئەوانەی کە پاریزگارو دیندارن ، لەجیگەی و شوینیکی زۆر ئارامدا ژیان دەبەنە سەر ..!! لە باخچە کانی بەهەشتدا لە پال کاریزو کانیاوەکان وتاقگە کاندا دەژین ، هەمیشە لەسەیران و خۆشیدان ..!! دەپۆشن لە ئاورشمی تەنك و ئەستوور ، لە و کاتەدا خوشەویستان بەرانبەر یەك دادەنیشن و بەرووی خۆشەوە بۆ یەکتر دەروانن و گفتوگۆی خۆش بە تام دەکەن ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُنْدُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِنْ فِضَّةٍ وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا﴾ الانسان ٢١ . واتا : پۆشاکی بەختەوەران ئاوریشمی سەوزی تەنکە کەبەسەر پۆشاکی ئاوریشمی ئەستووردا لەبەریان کردووە ، بە بازنی زیو رازینرانەتەوە ، ئینجا لەلایەن پەروەردگاریانەوە شەرابی پاك بیگەرد وخاوینیان پیشکەش کراوە ..!!

ئەم فەرموودەیە لە (مسندی ئیمامی احمد) دا هاتووە: (( أن رجلا قال : يا رسول الله ، اخبرنا عن ثياب أهل الجنه .. خلقا تخلف أم نسجا تنسج ؟! قال : فضحك بعض القوم ، فقال رسول الله (صلى الله عليه وسلم ) : (( مم تضحكون ؟ من جاهل يسأل علما !! )) ثم أكب رسول الله (صلى الله عليه وسلم ) قال : (( أين السائل ؟! )) قال : هو ذا يا رسول الله ، قال (( لا بل تشقق عنها ثمر الجنة )) رواه احمد .

واتە : پیاویك ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) : هەوالی پۆشاكی بەهەشتم پێ دا ..ئایا دروست كراوە یان چنیراوە یان دووراوە ..؟! هەندێك پێ كەنین بە قسە كەی یان بە پرسیارە كەی ، پێغەمبەری خواش فەرمووی : بۆچی پێ دەكەنن ئەو نەزانە پرسیار دەكات بۆ زانست و علم وەرگرتن ، پاشان پێغەمبەر(صلى الله عليهوسلم ) كەمێك بێ دەنگ بوو یان كەمێك وەستا ، فەرمووی : كێ پرسیاری كرد ، ووپان : ئەم پیاوە ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : نا بەلكو حەزی لە خۆشەیەكان یان نعیمە ت و ثمرە راتی بەهەشتە ..!! خوای گەورە زانا ترە ..

وە لە (ابو هريره ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( لقيد سوط أحدكم في الجنة خير من الدنيا ومثلها معها ،ولقاب قوس أحدكم من الجنة خير من الدنيا ومثلها معها ، ولنصيف امرأة من الجنة خير من الدنيا ومثلها معها ، قال : قلت : يا رسول الله وما والنصيف ؟! قال : الخمار )).رواه احمد وصححه الالباني في صحيح ترغيب (٣٧٦٧).

واتە :وشوێنی قامچیەك لە بەهەشت دا خێرو پاداشتی زیاترە لە دوینادا ئەوەی لە گەلی دایە ،بەقەد شوێنی كەوانیەك لەبەهەشت دا خێر و پاداشتی زیاتر لە دونیا دا لە گەل ئەوەی لە گەلی دایە ،النصيف امرأە واتە: تاری سەری ئافرە ، بەقەد شوێنی تارەیی سەری ئافرتێك لە بەهشت خێر و پاداشتی زیاتر ،لە دونیاو ئەوەی لەگەلی دایە ووتیان : النصيف امراە چیە ..؟! فەرمووی : خمار واتە : تارایی سەری ئافرەت ..!! خوای گەورە زاناترە ..

لە (براء ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : (( أهديت لرسول الله (صلى الله عليه وسلم ) حلة حرير ، فجعل أصحابه يلمسونها ويعجبون من لينها فقال ر سول الله (صلى الله عليه وسلم ) : (( تعجبون من لين هذه ..؟! لمناديل سعد بن معاذ في الجنة خير منها وألين )). متفق عليه رواه البخاري برقم (٢٦١٦).

واتە : پۆشاكیكی ئاورشمیان بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) هینا ، هاوەلانی لە جوانی نەرمی و نیانی سەرسام بوون پێ ، پێغەمبەی خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : دەستە سەر كانی (سعدی كوری موعاز ) لە بەهشت دا زۆر خێر ترو چاكترە باشترە لە مە ..!!

له (ابو هويره ) وه – خوالى رازى بيت – دەليت : ئەى ابا القاسم (صلى الله عليه وسلم ) نەفەرمووە : (( أن أول زمرة تدخل الجنة على صورة القمر ليلة البدر ،ولاتي تليها على أضواء كوكوب دري في السماء ،لكل امرئ منهم زوجنتان اثنتان ،يرى مخ سوقهما من وراء اللحم وما في الجنة اعزب )). رواه البخاري بدالخق برقم ٣٠٧٣. واته: يەكەمين دەست كە دەچنە بەهشتەوە لەسەر شيوەى مانگى چواردەن ، دەستەى دواى ئەوانيش لەسەر شيوەى درەوشاوە ترين ئەستيرە يان كوكب درى يە لە ئاسماندا ،هە رپياويك لەوانەدووژنى هەيە ، مۆخى لاقيان لەديوى گۆشتەوە دیارە ، لە بەهەشت كەسى بى ژن نيە يان بى هاوسەر يان رەبەن ..!!

هەروەها لە (ابو هويره )وه – خوا لى رازى بيت – دەليت : پيغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموويت : (( اهل الجنة جرد مرد كحل لا يفنى شبابهم ولا تبلى ثيابهم )). رواه الترمذي حيث غريب.

وته :خەلكى بەهشت جەستەيان بى مووە يان بى تووكە ، جوان گەنج لاو پاك و خاوينين ،چاويان بەكل يام كحل رەش كردووە يان پر لە كلە، گە نجى جوانيان هەر گيز بەسەر ناچيت بەواتاى قەد پيرى روويان تى ناكات و پير نابن ،وە جل بەرگەكانيشيان هەر گيز نادرى و رزى نابن ..!!

هەروەها لە فەرموودەيەكى ترى پيغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموويت : (( لو أن ما يقل ظفر مما في الجنة بدا التزخرفت له بين خوافيق السموات والارض ولو أن رجلامن أهل الجنة اطلع فبدا أساوره لطمس ضوء الشمس كما تطمس الشمس ضوء النجوم )). صحيح الترمذي .

وته : ئەگەر ئەوەندەى نينۆكى هەليبگرى لە بەهەشتدا دەركەويت هەرچى لەنيوان ئاسمانەكان و زەويدايە دەرەوشيتەوە ، ئەگەر پياوى لەخەلكى بەهەشت دەركەوى و بازنە كانى دەركەوى رووناكى ژۆر يان خۆر ،ناهيليت وە چۆن خۆر يان رۆژ رووناكى ئەستيرە ناهيلى ..!!

## هەشتەم: فەرش و راخەری مالی نعیم

بی گومان هەر مالی کە تیدا بۆ حەوانەوە و نیشتە جی بوون بۆ هەمیشە یی بمینیتەوە دەبیت فرش و راخەرو شوینی دانیشتنی زۆر چاك و باش کە بەهیچ شیوەیەك بە عەقلی مرۆڤ دانایەت کەچەندە جوان و رازاوەیە، بۆ ئەوەی ئەگەر لە مالی دونیا ئەهلی بەهەشت هیچ لەم فەرش و راخەرو کورسی قەنەفەی جۆراو جۆرو رازاوەو نەبینی بیت ، ئەوە لە مالی نعیم خوا گەورە بە ئیمانداارانی دەبەخشیت ، ئەگەر پارچەی ئەم راخەرو فرشەی بەهشت بیتە دونیا بە هاو قیمەتی هەموو دونیاو زیاتریش دەکات چۆنکە ئەوەندە بەجوانی دروست کراوان رازینراوەنەتەوە بە شتە گران بەهاکان وە ك: ئاوریشم و زیر ئالتوون زیو یاقووت و مرجان درو مرواری بەردی بەنرخ و گرانبەها ، هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ((فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ (١٣) وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ (١٤) وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ (١٥) وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ﴾الغاشیه ١٣-١٦. واتا: هەروەها تەختە و سیستەمی زۆر بلندو جیگەی حەوانەوەی نایابی لیە ..!!لە نزیك ئەو بەختەوەرانەوە لە هەر کویدا بن کوپ ودۆلکەو سوراحی و بەرداخی نایاب جوان رازاوەو نەخشین دانراوە ..!!هەروەها بالیف و سەرین بۆ پالپشتی زۆرجوان رازاوەی تیادایە کە بەریکو پیکی ریزکراون ..!!هەروەها فرش رایەخی قەشەنگ وجوان نایاب نەخشین کراوی تیادا راخراون فرش کراون ،کە هەموو کۆشکو تەلارو ڤیلاکانی پیرازینراوەتەوە ..!! بی گومان ئەگەر نموونەیەکی لە کۆش تەلارەکانی ئیستای ژیانی دونیا ببینین کەوا ئیستا لەشاری دوبەی پی دەلین برجی خلیفە یان هەر کۆشکیکی تری کە عەقل ی مرۆڤ دەوەستینیت لەجوانی رازاوەی ئەم کۆشکە ، جا ئەگەر ( خوای گەورە ) ئەم کۆشکە و رازاندبیتەوە بە فەرشی گران بەهاو راخەری جوان قەشەنك وە فەروانەیەکەشی بە چاو ناخەلیندریت بۆ ئەهلی بەهەشت یانبۆ ئەو کەسەی کە لەدونیادا چاکاو کردوەباشەکانی ئە نجام دا وە ،بی گومان جگای سەر سورمانە کە خوای گەورە لە قورئانەکەی دا وا زۆر بەجوانی باسی دەکات کە چەندەها جار خۆش ترو رازاوەتر لەمالی دونیا ئەوەیەکە خوای گەوە ، پی دەلیت جنات نعیم یان مالی نعیم بەرستی نعیمە بۆ ئیمانداران ..!!بی گومان ئەمە وەعدی پەروەردگارا کە بەهەشتیەکان دەچنە ژوورەوە بەم شیوەیە پیشوازیان لی دەکریت بەفەرش ورایەخی جوان وگرانبەهاو بەسەرینی بەنرخ و رازاوە و بە جۆرەها رنگی جوان بۆ ئیمانداران ئامادەکراوە کە نەعەقل نەبیرو هۆش تعامل دەکات لە جوانی ئەم پیخەفو رایەخو فرشە جوانانە ..!!

**هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموويت :** ﴿ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ آمِنِينَ (٤٦) وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ﴾**الحجر ٤٦-٤٧ .واتا: پێیان دەوترێت : فەرموون بچنە ناوی بەسەلامەتی و سەلاو تان لەسەر بێت ،ژیانی پڕ لە خۆشی ئاسوودەیی هێمنی و تیایدا بەسەر بەرن ..!! لە کاتیدا هەرچی کینەو بوغزە لە دڵ و دەروونیاندا دەرمان کێشاو ئەو بەختەوەرانە برِی یەکترن و لەسر کورسی وقەنەفە رازاوەکان لەبەرامبەر یەکەوە دانیشتون لە بەیەك گەیشتنەوەیەکی پڕ سۆزو خۆشەویستیدا ،تەماشای یەکتر دەکەن و سلام لە یەکتر دەکەن و سوپاس وستایشی پەروەردگار دەکەن ..!!**

**هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموويت :** ﴿مُتَّكِئِينَ عَلَى فُرُشٍ بَطَائِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ وَجَنَى الْجَنَّتَيْنِ دَانٍ﴾**الرحمن ٥٤ . واتا: لەو بەهەشتە خۆشەدا بەختەوەران لە سەر کورسی و قەنەفەو جێگە و ڕێگەی خۆشەکان ، شانیان داداوە کە لە ئاوریشمی تایبەت چنینراوە ( داخۆ بەرگەکەی لەچی بێت ؟! وە لی کردنەوە هەرمیوەیەکیش نزیك و ئاسانەو درختیەکان خۆیان سەر فرە دەهینن بۆ ئە بختەوەرانە ..؟!**

**هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموويت:** ﴿مُتَّكِئِينَ عَلَى رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ﴾**الرحمن ٧٦. واتا: شانیان داوە لەسەر قەنەفەی سەوزاوی جوان و دۆشەکی یان ڕاخەری نایاب و ڕازاوە نەخشینراون..!!**

**لە ( ابی سعید خدری ) – خوا لی ڕازی بێت – دەڵێت : پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموويەتی : دەربارەی ( فرش مرفوع ) فەرموويەتی :** (( ارتفاعها لكما بين السماء والارض مسيرة خمسمائة سنة )).

**هذا الحديث غريب ولكن بعض اهل علم في تفسير هذا الحديث يقولون أن معنا الفرش في الدرجات ،وبين الدرجات كما بين السماء والارض . رواه الترمزي**

**واتا: دەربارەی ( ڕاخەرو فەرشی بەرزو بلندی لی یە ) ، فەرموويەتی: بەهەشت ڕاخەرو فەرشی بەرزو بلندی لی یە هیندە نیوان ئاسمان و زەوی دووری ( ٥٠٠ ) پینج سەد ساڵە )) هەندیك لەزانایان لە تفسیری ئەم فەرموودەیە دەڵێن : ڕاخەرو فەرشەکان لە بەرزو بلندی نیوان پلە کانی بەهەشتە پلەیەك بۆ پلە یەکی تری نیوانیانە هیندەی ماوەی نیوان ئاسمان و زەویە ..؟!**

## نۆیەم : بازارو مۆلی مالی نعیم

بەڵی لە مالی نعیم یان لە بەهەشتدا شوێنێك هەیە كە بازاری خەڵكی بەهەشتە لەویدا ئیماندران كۆدەبنەوە لە رۆژی هەینی دا ،لەویدا گفتوگۆ و قەس خۆش دەكە هەروەها بەبیر هیناونەوەی ژیانی دونیا باس دەكەن ،هەروەها سوپاسی ( خوای گەورە ) دەكەن كە بەونازو نیعمەتە كە پی بەخشیون لە مالی نعیم.

لە ( ئەنسی كوری مالك )وە – خوا لی رازی بێت – دەڵیت : لە پیغەمبەری خواوە ( صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : (( إن فى الجنه لسوقا يأتونها كل جمعه ،فتهب ريح الشمال فتحثون فى وجوههم وثيابهم المسك ،فيزادون حسنا وجمالا ، فيرجعون إلى أهليهم ،وقد ازدادوا حسنا وجمالا،فيقول لهم أهلوهم والله لقد اددتم بعندنا حسنا وجمالا )).رواه مسلم برقم ( ٢٨٣٣ ).

واتە : لە بەهەشتدا بازارێك هەیە هەموو رۆژێك یان هەموو هەینی یەك بە هەشتیەكان سەردانی دەكەن ،شنەبای شەمال لیبیان هەلدەكات و ، جلو بەرگی پۆشاك و رەنگ و روخساریان تەپو تۆزاوی دەكات ، هیندەی تر جوان گەشاوە تر و قەشنگ دەبن ،كە دەگەرینەوە بۆ ناو خیزانەكانیان پییان دەڵین : بە خوا دوای ئەوەی لای ئیمە رۆیشتن جواترو گەشاوەتر قەشەنگ ترو بوون ئەوانیش دەڵین : بە خوا ئیوەش لە پاش ئیمە هیندەی تر جواتر و گەشاوە ترو قەشەنگ تر بوو ..؟!

هەروەها لە فەرموودەیەكی سنن ترمزی دا هاتووە بە ( ضعیف )یی لە باب فى سوق الجنه لە ( ابو هریرە )وە – خوا لی رازی بێت – دەڵیت : (( أسال الله أن يجمع بيني وبينك في سوق الجنة ، فقال سعيد : فيها سوق ؟ قال : نعم ، اخبرني رسول الله صلى الله عليه وسلم : فه رموويه تي : ان أهل الجنة إذا دخلوها نزلوا فيها بفضل أعمالهم ،ثم يؤذن في مقدار يوم الجمعة من أيام الدنيا فيزورون ربهم ، ويبرز لهم عرش ويتبدى لهم في روضة من رياض الجنة ،فتوضع لهم منابر من نور ومنابر من لؤلؤ ،ومنابر من ياقوت ،ومنابر من زبرجد ،ومنابر من ذهب ومنابر من فضة ، ويجلس ادناهم وما فيهم من دنى علي كثبان المسك والكافور ، وما يرون أن أصحاب الكراسي بأفضل منهم مجلسا .قال : ابو هريرة قلت : يار رسول الله وهل نرى ربنا ..؟! قال : نعم . قال : هل تتمارون فر رؤية الشمس والقمر ليلة البدر ..؟! قلنا : لا . قال : كذلك لاتتمارون في رؤية ربك وبقى في ذلك المجلس رجل إلا حاضره الله محاضرة حتى يقول للرجل منهم : يا فلان ابن فلان أتتذكر يوم قلت : كذا وكذا ..؟! فيذكره ببعض غدراته في الدنيا ، فيقول : يارب أفلم تفر لي ..؟!

فيقول : بلى ، فبسعة مغفرتي بلغت منزلتك هذه ،فبينما هم على ذلك غشيتهم سبحانة من فوقهم فأمطرت عليهم طيبا لم يجدوا مثل ريحه شيئا قط ،ويقول ربنا تبارك وتعاليى: قوموا إلى ما أعددت لكم من الكرامة فخذوا ما اشتهيتم فناتي سوقا قد حفت به الملائكة فيه ما لم تنظر العيوم إلى مثله ،ولم تسمع الاذان ،ولم يخطر على القلوب فيحمل إلينا ما اشتهينا ،ليس يباع فيها ولا يشترى ، وفي ذلك السوق يلقى اهل الجنة بعضهم بعضا ،قال فيقبل الرجل ذو المنزلة المرتعة فيلقى من هو دونه وما فيهم دني فيروعه ما يرى عليه من اللباس فما ينقضي آخر حديثة حتى يتخيل عليه ما هو أحسن منه ، وذلك انه لا ينبغي لأحد أن يحزن فيها ،ثم ننصرف إلى منازلنا ، فيتلقانا ازواجنا ، فيقلن مرحبا وأهلا ، لقد جئت وإن بك من الجمال أفضل مما فارقتنا علية ، فيقول : أنا جالسنا اليوم ربنا الجبار ، ويحقنا أن ننقلب بمثل ما أنقلبنا )). رواه الترمذي حديث غريب برقم ٢٥٤٩ .

واته : ( ابو هريرة ) – خوا لی رازی بيت – دەليت : دوا دەكە لە ( خوای گەورە ) منيش تۆش واتە : ( سعدی كوری موسەيب ) لە بازاری بەهەشت كۆبكاتەوە، ( سعيد ) ووتی : بۆ چی بەهەشت بازاری هەيە ..؟! ( ابو هريرە )ش ووتی : بەلی . پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم پی راگەياندم فەرمووی : كاتی خەلكی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوە بە پيی زۆر و كەمی كردوە صاكەكانيان پايە ی بەرز يان پلەی نزم وەردەگرن لەرۆژی هەينی يان جمعه دا ( خوای پەروەرگاريان ) ريگەيان پی دە دات سەردانی بكەن ، بە ئەندازەی رۆژە كانی ژيانی دونيا دا كاتی يان لی دەروات ، لە باخی لەباخەكانی بەهەشتدا ( خوای گەورە ) بەبی پەردە خۆی پی يان نيشان دەدات وە دەی بينن ، مينبەريان بۆ ئامادە كراوە ، هەنديكيان لەسەر مينبەری نوور يان ريخەری نور دادەنيشن ، هەنديكيان لەسەر فرش وريخەرو مينبەری مرواری دادەنيشت هەنيكيان لەسەر ريخەر فرش قەنەفەو مينبەری ياقووت دادەنيشن ،وهەنديكی تريان لەسەر ريخەری يانقەنفەی يان مينبەری ( زبرجد ) ئەويش جۆريكە لە بەردی گرانبەها بەنرخ ، دادەنيشن ، هەنديكی تريان لەسەر ريخەری يان مينبەری زير يان ئالتوون دادەنيشن هەنديكی تريان لە سەر ريخەری يان مينبەری زيو دادەنيشن ، پلە هەر نزمەكەيان لەسەر گردۆكەيان تە پۆلكە مسك و كافورە دادەنيشن ، وا گومان نابەم كە خاوەن ريخەرو ميبەرەكان لەوان چاكتر بن كە و بە بە شی خۆيان رازين . ( ابو هرير ) ووتی : ئەی پيغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئايا پەروەردگارمان دەبينين ..؟! ئەويش فەرمووی : بەلی . ئايا لە بينينی خۆر مانگی چواردە گومانتان هەيە ..؟! ئەلی ، ووتم : نەخير . ئەويش فەرمووی : دەی بەو شيوەيە بەروون و ئاشكرا پەروەردگاتان دەبينن و هيچ شك و گومانيكتان نامينی ، هيچ يەكی لە ئامادەبووانی ئە كۆر و دانيشتنە نيە ئيلا ( خوای گەورە ) گفتووگۆی لە گەل دەكات ، وە پی دەفەرموويت : ئەی فلانی كوری فلان ، فلان رۆژو فلان رۆژت لە بيرە دەی چيت دەووت ..؟! هەنديك لە بی فەرمانی گوناهی خۆی بەبيردينيتەوە ، ئەويش دەلی : ئەی پەروەردگارم !! ئەی تۆ ليم خۆش نەبووی ..؟!

( خوای گەورە )ش دەفەرمووی : بەلی بە رەحمەتی بی سنوور و فەرانی خۆم نەبوایە تۆ نەدەگەیشتیتە ئە پایە بەرز ومەزنە کە چاوت بەمن بکەویت ، ئیتر لەسەر ئەو حالەتن لە پر پەلە هەوریك لەسەرەوە دایان دەپۆشی بۆن و بەرامیکی زۆر خۆش دەبارینی بەسەریاندا هەرگیز بۆنی وا خۆشیان نەبینیوە ، ( خوای گەورە خاون شکۆ وپاك و بیگەرد ) دەفەرموویت : ئادەی هەست بچن بەدەم ئەو ریزو نازو نیعمەتانەوە کە بۆم ئامادە کردوون ، هەرچی ئارەزوو دەکەن بیبەن بۆ خۆتان جا دەچین بۆ بازاری مەلائیکە لە هەموولایەکەوە دەوریان داوە ، بازارەکە شتی وای تیدایە نەبەچاو بینراوە ،نەبگویی بیستراوە ، نەهاتووە بە دلی هیچ کەسکدا ، جا حەزمان لەچی بی هەلی دەگرن بۆ مان دەبیەنەوە بۆ ناو کۆشك و تەلارەکانمان و کرین و فرشتنی تیدا نیە ، خەلك لە بارزەدا ، دەگەن بەیەك ، فەرمووی: وا ریك دەکەوی پیاوی خاوەن پایە بەرز دەگات بە پیاوی لە خۆی خوار ترو کەچاویان بەیەك دەکەوی لەبەر جوانی و کەشخەیی و قەشەنگی جل بەرگ و پۆشا کەکەی سەرسام دەبیتەوە ،بەلامپیش ئەوەی خەیالەکەی تەواوبی لەبەر ئەوەی دلی خۆی دانەمینی تەماشا دەکات جل بەرگ و پۆشاکی خۆی لە ئی ئەو جواترو رازاوە ترە یان کەشخەتر ، ئەمەش لەبەر ئەوەی نابیت کەس لە بەهەشت خەمو پەژارەی هەبیت یان بخوات یان حسوودی هەبیت ، ئینجا دەچینەوە بۆ مالەوە هاوسەرەکانمان دین بە پیرمانەوە و دەلین : مەرحباتان لی بی یان سلاوتان لی بی و بەخیر بییتەوە لەجاران جوانترو بووی ، ئەویش دەلی : ئەمرۆ چامان بە پەروەدگارمان کەوتووە لەبەرئەوە حەقی خۆیەتی جواتر بووین ..............................................................!!؟

## دەیەم : بۆن خاك و باران و كانیاو رووباره كانى مالى نعیم

بەلی بەهەشت بۆنیكی زۆر خۆشی هەیە كە نە دەتوانریت وصفی بكەی بەجوان نە دل وخیال دركی پی دەكات چاوی بینیویەتی ، بەلی بۆ ئیمانداران ئامادە كراوە كە بۆنەكەی ( ٤٠ ) سال ریگە دەروات یان ( ٧٠ ) سال ریگە دەروات وە یان ( ١٠٠ ) سال ریگە ویان ( ٥٠٠ ) سال ریگە بۆنی دەروات ، وەك بۆنیكی مسك زۆر خۆش ، هەروەك ئەم فەرموودە یەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( من قتل رجلا من أهل الذمة لم يجد الجنة وإن ريحها ليوجد من مسيرة سبعين عاما )) .رواه النسائي كتاب القامة (٤٧٤٩). واتە : هەر كەسیك كەسكیكی ئەهلی زیممە یان بكوژیت ، بۆنی بەهشت ناكات كە بۆنی بەهەشتیش دووری ( ٧٠ ) سال ریە ..!!

بەلی خاكی مالی نعیم وە نانی سپی وایە هەرو ەك ئەفەرموودەیەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( الارض الجنة خبزة بيضاء )) . حادي الارواح ابن قيم ص ٢٢٣ .

هەروەها لە فەرموودەیەكی صحیح مسلم دا هاتووە ،لە (ئەنسی كوری مالیك )وە – خوالی رازی بیت – دەفەرموویت : (( أدخلت الجنة ،فإذا فيها جنادل اللؤلؤ، وإذا تربها المسك )).متفق عليه رواه البخاري ( ٣٣٤٢ ) . واتە :كە چوومە بەهەشت بینم بەردی مرواری تیدایەو ،خاك خۆلە كەشی میسكە ..!!

هەروەها لە ( ابو سعید ) هاتوو ە لە (ئبن صیاد ) لەبارەی خۆلی بەهەشت لە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) پرسی : ئەویش فەرمووی : (( هى درمكة بيضاء مسك خالص )). صححح مسلم .

واتە : ووردە ئاردیكی سپی كە میسكی پاكە ..

هەروەها لە فەرموودەیەكی تر دا هاتووە ،لە ( ابو هریره ) وە دەلی : لە پیغەمبەری خوام ( صلی الله علیه وسلم ) پرسی : (( حدثنا عن الجنة ما بناؤها ؟! قال : لبنة ذهب ولبنة فضة ، وملاطها المسك الاذفر، وحصباؤها اللؤلؤا والياقوت ،ترابها الزعفران ،من يدخلها ينعم ولا ييأس ويخلد ولايموت ،لا تبلى ثيابه ،ولا ينفى شبابه .. )).اخرجه احمد .

واتە :خشتیك زیر و ، خشتیك لە زیو ، چینی بنی نیوان دووخشتانیش میسكی كی هەر بۆن خۆشە ، وردە بەردی درو یاقوت مرواوی تیدایە ، خۆلەكەشی زەعفرانە ، هەر كەسی بچیتە نیوی لە خۆشی دا بی و هەرگیز ناخۆشی نابینی و ، تا هەمیشەیی دەژی هەرگیز نامریت ، و جل بەرگی نادری رزی نابیت ،هەرگیز پیر نابن هەر بەلا وی دەمینەوە ..!!

ڕووبارەکانی مالی نعیم کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾البقره ٢٥ . واتا : ئەی پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) مژدە بدە بەوانەی کە باوەڕیان هیناوە و کارو کردەوەی چاکەیان ئە نجامداوە بەوەی باخەکانی بەهەشت کە چەندەها ڕووبار بەژیر درەخت و بەناو باخەکانیدا دەڕوات ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿أُولَئِكَ لَهُمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ﴾الكهف ٣١ . واتا : ئەوانەی باخەکانی بەهەشتی ( عدن ) بۆیان ئامادەیە چەندەها ڕووبار بە بەردەمیاندا دەڕوات ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِنْ مَاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِنْ لَبَنٍ لَمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِنْ خَمْرٍ لَذَّةٍ لِلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِنْ عَسَلٍ مُصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ﴾محمد ١٥ . واتا : وینەی ئەو بەهەشتەی کە بەلیند دراوە بدریت بە ئیمانداران و خواناسان و پاریزگاران ، ئەمەیە : چەندەها ڕووبار لە ئاوی سازگار و تام نەگۆڕاوی تیدایە ، هەروەها چەندها ڕووباری شیر کەتامی تیك نەچووە ، هەروەها چەندەها ڕووباری لەشەرابی تام خۆش و بۆنخۆشی ، ( کە لە خواردنەوەی بیزار نابن ولبەر چاویان ناکەویت ) هەروەها بۆ ئەوانەی دیخۆنەوەی چەندەها ڕووبار لە هەنگوینی صاف خالص و بیگەر ، هەروەها بۆیان هەیە لەو بەهەشتەدا لە هەموو جۆرە بەرو بووم و میوەیەکی جوان و بەتام و بۆن خۆش بخۆن ، هاوکات لەگەل لی خۆش بوونی خۆشەویستی پەروەردگاریاندا ..!!

بی گومان ئەو چوار ڕووبارە لە دونیا دانیە هەریەکیان لەزەت و تام چیژی خۆی هەیە ، ڕووباری خمر زۆر جیاوازە لە گەل خمری دونیا چونکە خمری دونیا پیسە وە کارو کردەوەی شەیتانەکان ، یان ڕووباری ئاو ئەو ئاوە نیە کەلەژیانی دونی دا هەیە چونکە ( ئاوی کی پاك بیگەرد صافە ) یان ڕووباری شیر یان ڕوویاری هەنگوین ،بەلی ئەم چوارد ڕووبارە نەچاو بینیویەتی نەبەخیالی بینراوە نەبە دل هەستی پیکراوە ..!؟

هەروەها پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : (( راى أربعة آنهار يخرج من أصلها نهران باطنان ،فلقت : يا جبريل ! ما هذا الانهار ؟! قال : أما النهران الباطنان، فنهران في الجنة ،واما الظاهران فالنيل والفرات ...))رواه مسلم كتاب الايمان رقم ١٦٤ . واته : چوار رووباری بینی لە (ستدرمنتهى ) هەلدەقولان ، دوو رووباری دیارو دوو رووباری نادیار ، ووتم : جبريل ! ئەم رووبارانە چین ؟! ووتی هەرچی دوو رووبارە نادیارەکەن ئەم دوو رووبارە لە بەهەشتدان ئە و دوو رووبارە دیارەکەش ئەوا نیل و فوراتە ..!!

هەروەها لە (ابو هريره )وە - خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : (( سيحان وجيحان والفرات والنيل كل من انهار الجنة )).صحيح مسلم كتاب الجنة برقم ٢٨٣٩. واتە : ئە م چوار رووبارەکانی (سيحان جيحان نيل فورات ) لە بەهەشت دان ..!!

هەروەها رووباریکی تریش کە لەقورئانی پیرۆز باس کراوە ئەویش ئاوی (الكوثر ) یان رووباری (الكوثر )

(خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ﴾ الكوثر ١ .واتە : بەراستی ئمە خیر چاکە و خۆشی هەر دوو جیهان و ناوبانگی چاکەی تۆمان محمد (صلى الله عليه وسلم ) بی ئەندازە و بی سنوور کردووە لە هەموو جەرخ و زەمانیکدا ..!!

کە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) کەچۆتە ناوبەهەشت ئەمەی بینیوە هەروە ك لە (ئەنسی کوری مالیکە )وە بۆمان دەگیریتەوە- خوا لی رازی بیت – دە لیت : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( بينما أن أسير فى الجنه أنا بنهر حافتاه قباب الدر المجوف ،قلت : ما هذا يا جبريل ..؟! قال هذا الكوثر الذي أعطاك ربك ،فاذا طيبة او طنيه مسك أذفر )).صحيح البخاري كتاب الرقاق باب الحوض فتح باري ٤٦٤/١١ . واتە :کاتیك لە بەهەشتدا دەرۆیشتم گەیشتمە رووباریك لیوارەکانی گومبەتی دوری کلۆر بوون ، ووتم : جبريل ئەوە چیە ؟! فەرمووی : ئەمە ئەوە (الكوثر ) رەیە کە پەروەدگارت پی بەخشیوی ،بۆنەکەی میسکیکی هەرە بۆن خۆشە ..!!

له (ئەنسی کوری مالیك ) دا – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : (( هو نهر أعطانيه الله في الجنة ، ترابة مسك ،ماؤه ابيض من اللبن ،واحلى من العسل ،ترده طيور أعناقها مثل أعناق الجزور .. )). بداية والنهاية ابن كثير ٣٤٦/٢.

واتە : الكوثر رووباریکە خودا لەبە هەشت پی بە خشیوم خۆلە کەی میسکە ،ئاوەکەی لەشیر سپی ترو ،لەهەنگوین شیرینترە ،باڵندەی وای دەچنە سەر ملیان وەکو ملی حووشترە ..!!

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرموویە تی : (( إن في الجنة بحر الماء وبحر العسل وبحر للبن وبحر الخمر ،ثم تشقق الانهار بعد .. ))رواه الترمذي صحيح حسن برقم ٢٥٧١ . واتە: دەریایە ئاو و دەریایی هەنگوین و دەریایی شیر و دەریایی شەراب یان خمر لە بەهەشتدایە ، دوای ئەوەی بەهەشتیەکان دەچنە بە هەشتەوە ،لە پاشان دا دەریایی تر هەلدەقولی ..!!

له (ئەنسی کوری مالك )وە – خوا لی رازی بیت – دە لیت : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویەتی : (( من سأل الله الجنة ثلاث مرات قالت الجنة : اللهم ادخلة الجنة ، ومن استجار من النار ثلاث مرات قالت النار : اللهم اجره من النار .. )) رواه الترمزي برقم ٢٥٧٢ .

واتە : هەرکەسی سی جار داوای بەهەشت بکات و بلی : خودایە بمخەرە بەهەشتەوە ، بەهەشت دەلی : خودایە بیخەرە بەهەشتەوە ،هەرکەسی سی جار پەنا بگری بە خوا لە ئاگری دۆزەخ بلی : خودایە پەنات پی دەگرم لەئاگری دۆزەخ ،ئاگری دۆزەخ دەلی خودایە لە ئاگری دۆزەخ بیپاریزە ..!!

هەروەها لە فەرموودەیەکی تری پیغەمبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( الشهداء على بارق نهر بباب الجنة ،في قبة خضراء ، يخرج عليهم رزقهم من الجنة بكرة وعشيا .. )). مسند احمد .

واتە : شەهیدان لەسەر باریقن کە رووباریکە لە دەرگاکەی بەهشتدا ،لە گومبەتیکی سەوز یان کەسك دا ، بەیانیان و ئیواران رۆزی رزق یان لە بەهەشتەوە بۆ دیت ..!!

بی گومان له مالی نعیم دا کانی کانیاوی جۆراو جۆری زۆری هەیە کەجیاوازیان زۆرە لە تام چێژ وەرگرتن ئەوەیە کە هەندیکیان ( خوای گەورە ) بۆمان باس دەکات لە قورئانە پیرۆزە کەیدا کە دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ الحجر ٤٥ . واتا: لەو لاشە و بەراستی خواناسا ن ئیمانداران پاریزکاران لە ناو باخەکانی بەهەشتداو کانیاوە سارزگارە کاندان ..!! هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ﴾ المرسلات ٤١ . واتا : لەولاشەوە بەراستی دیندارو خوا ناسان و پاریزکاران ،وا لەژیر سیبەر دا ، لە پال کانیاو و تاڤگە کاندا ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) وە سفی دوو بەهەشت دە کات لە سورەتی الرحمن ، کە ئامادەی کردووە بۆ ئەو کەسانەی لەخوای خۆیات ترساون کارو کردەوەی چاکە ئە نجام دەدن ، هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ﴾الرحمن ٥٠ واتا : دوو سەرچاوەی ئاو کانیاوی سازگاریان تیدایە بە خور یان بەە هیز بە جۆگەلەکاندا دەرۆن ..!! هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ﴾الرحمن ٦٦. واتا: دوو سەرچاوەی ئاوی کانیاویان تیدایە هەلدەقولین ،کە دیمەنیکی زۆر جوان زۆر دلفرینە ..!!

هەروەها دوو کانیاوی دیکەش هەن لە بەهەشتدا ئەو کانیاوانەش کە چاکە کاران و ئەوانەی لەخوای گەورە خۆیان نزیك دەکەنەوە ،لە مالی دونیا خۆیان ئامادەکردووە بۆ مالی نعیم ، ئەکەسانە لەم کانیاوانە دەخۆنەوە کەئاویکی پاك سازگار بی گەردە ،یەکەم ( کافور ) دووەم ( تسنیم ) سی یەم ( سلسبیلە )

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِنْ كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا (٥) عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا﴾الانسان ٥-٦ .

( خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿وَمِزَاجُهُ مِنْ تَسْنِيمٍ (٢٧) عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُونَ﴾المطففين٢٧-٢٨ .

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّى سَلْسَبِيلًا﴾الانسان ١٨

له راستی دا باران بارین دیمەنیکی گەلەك جوان دل رفینە ،جا ئە و بارانەی کە لە ژیانی دونیادا دەباریت دووجۆرە جۆری یەکەم: رحمتە بۆ ژیانەوە وەك رووك دار بیسان و خاك زەوی دە بیتە رزق بەرکەت لەسەر رووی زەوی جۆری دووم : ئەو بارنەیە کە کە توورەیی خوای گەورەیە لە سەر زەوی دەبیتە سزاو بۆ سەر رووی زەوی کە بەم هۆیەوە لافاو تۆفان هەلدەستیت ، ئەو بەسەر قومەکانی رابردوودا هاتووە بە ئیستاشەوە بەردەوامە هەر بارانی توورەیی دەباریت وەك لەولاتاندا دەبیتە لافاو زریان تۆفان ، ئەو بوو سالی رابردوو لە شاری هەلیر رووی دا کە بە هۆی خرا پی و گەندەلی فسادی خەلکەکەیەوە بوو ..!! بەلی بارانی رحمەت بۆ ژیان ،یان بارانی سزا بۆ مردن ، هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾الانبياء٣٠ . واتا: لە ئاویش هەمووشتیکی زیندوومان فەراهەم هیناوە ،ئاو زۆربە پیکهاتەکانی زیندەوران رووەك لەشی مرۆڤ پیکدەهینیت ،ئایا ئەوانەهەر باروە ناهینن بەو راستیانە وبە دەسەلاتە بی سنوورەی ئیمە ؟!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَهُوَ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ حَتَّى إِذَا أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَاهُ لِبَلَدٍ مَيِّتٍ فَأَنْزَلْنَا بِهِ الْمَاءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِ مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ كَذَلِكَ نُخْرِجُ الْمَوْتَى لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾الاعراف ٥٧ . واتا: هەر ئەو خوایە کە بای شەمال ( هەلگری هەلمی ئاو ) دەنیریت لە کاتیکدا مژدەی بۆخەلك لەنیوان دوو دەستی رەحمەتی پەروەردگاردا ، هەتا وای لیدیت کە ئە بایە هەوری سەنگین هەلدەگریت ، ئەوسا دەینیرین بۆ ناوچەو ولاتیکی مردوو، جا بەهۆی ئەو ئاوەوە هەرچی بەروبوومە دەری دەهینین ،جا هەر ئا بەو شیوەیە مردووانیس لە ناخی زەوی دەردەهینین و زیندوو دەکەینەوە ، بۆ ئەوەی یاداووری وەر بگرن ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ مَطَرًا فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنْذَرِينَ﴾النمل ٥٨.

واتا : لە بەرە بەیاندا بەرد باران مان کردن ،ئای کە بەرد بارنی بیدار کراوەکان سەخت و دژوارە ..!!

بەلی جائەلیرە دا بۆ مان دەردەکەویت کەئە وبارانەی لەبەهەشتدایە بارانیکی جوان دل رفینە بەلام بارنی دونیا ووتمان دوو جۆرە یەکەم یان رەحمە ت بەرکەت بۆ سەر زەوی ئەوەی دووەمیان سزا توورەیی خوای گەورەیە ،بۆ سەر زەوی بەهۆی گوناهو تاون فسادی لە هەر میلەتیکدا هەبیت ..؟!

## یانزەم : دار و درەخت و باخەکانی مالی نعیم :

بی گومان دار و درختە باخەکانی مالی نعیم زۆرن جۆرا و جۆرن ، ئەوە کە ( خوای گەورە ) پی راگەیاندوین لە دارە کانی تری داری خورما داری هەنار ،ئەمانە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە لە بەهەشتدا هەن هەروەها درختی ( سدر و طلح ) کە داری نبق و داری مۆز ، بی گومان باخیشی زۆرە بە هەموو جۆر دار درختی بەرهەمە دارو بی بەرهەم بۆ جوانی رازاوەی باخەکانی مالی نعیم ، هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا (٣١) حَدَائِقَ وَأَعْنَابًا﴾النبأ ٣١-٣٢ . واتا: بەراستی بۆ خواناسان و پاریزکاران سەرفرازیەکی گەورە بەریوەیە ئەویش خۆشی شادی کامەرانی فراوان ئامادەیە ..!! کەچەندەها باخچەو باخەکانی جۆراو جۆری تری یە ..!!هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فِيهِمَا فَاكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ﴾الرحمن ٦٨. واتا: کە درختی میوەی دارخورماو هەناریان تیدایە ..!! هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ (٢٧) فِي سِدْرٍ مَخْضُودٍ (٢٨) وَطَلْحٍ مَنْضُودٍ (٢٩) وَظِلٍّ مَمْدُودٍ (٣٠) وَمَاءٍ مَسْكُوبٍ (٣١) وَفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ (٣٢) لَا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ﴾الواقعە ٢٧-٣٣ .واتا: کۆمەلی راستەکانیش ،چا چووزانی کە ئەوانیش لەچ خۆشیە کدان ..!! لە ژیر درختی سدری بی درکدان ..!!هەروەها درختی مۆزیش کەبەرهەمەکانی چین چین لەسەر یەکن ..!!لەژیر سیبەری دوو روو دریژدان لە باخەخۆشەکاندا ..!!تاڤگەی جوان و حەزو فوارەی رازاوەی تیدایە ،میوە زۆری جۆراو جۆری تیدایە ..!! نە بەرهەمەکانیان تەواو دەبیت نە قەدەغە کراویشە ..!!

بەلی درختی ( سدر ) درکاویە لە دونیادا بەلام لە بەهە شت دا درکەکەی پیوە نە ماوە ،بەرهەمەکەی پی دەلین: ( نەبق ) هەروەها درختی ( طلح ) ئەویش موزە ..!!

ئەوەی کە ( خوای گەورە ) دەربارەی درختەکان وەك نموونە هیناویەتەوە شتیکی زۆر کەمە بەلام جۆرەها میوە میوەزات و درخت و دار و رووەکی جۆراوە جۆری تیدایە کە نەچاو بینی یەتی نە گویی بیستیویەتی نە دل هەستی پی کردووە ، نە خیال درکی کردووە تەنها ( خوای گەورە ) زانایە بەم خۆشیانەی بەهەشت ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فِيهِمَا مِنْ كُلِّ فَاكِهَةٍ زَوْجَانِ﴾الرحمن ٥٢.واتا: لە هەموو جۆرە میوەیەك دوو جۆریان تیدایە ..!! هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿مُتَّكِئِينَ فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ﴾ص ٥١ .واتا: تیایدا بە ئاسوودەیی شانیان داداوە ، بەردەوام دوای میوەی زۆر و خواردنەوە ی هەمەجۆر دەكەن ..!! هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَفَاكِهَةٍ مِمَّا يَتَخَيَّرُونَ﴾الواقعە ٢٠ . واتا: میوەشیان بۆ دەگیرن بە ئارەزووی خۆیان لی هەلدەبرژیرن ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :ل﴿وَفَوَاكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ﴾المرسلات ٤٢ . واتا : لە هەر جۆرە میوە یەك كە ئارەزووی بكەن بۆ یان ئامادەیە و پیشكەشیان دەكریت ..!!

هەروەها ( ابن كثیر ) لە بدایة والنهایة دا ٢٦٢/٢ ، باسی بەروبوومی بەهشتی هیناوەتەوە ،كە گیشتۆتە ئەم دەر ئەنجامەی كە خودا بە كەم شتیك لە زۆر لەم درخت و دار میوانەی ئاگادار كردینەوە ،هەروەها بەشتی سادەش لە شتی گەورە و مەزن ئاگاداری كردووین ،كاتی باسی درەخی ( سدر ) یان درختی ( طلح ) دەكات ، ( ابن كثیر ) دەلی : تەنها ئەو درختەی ( سدر ) لە ژیانی دونیادا تنها درختیكی بی بەری لاوازە دركاویە ، پی دە ووتریت ( نبق ) سەرەرای دركی زۆر ، هەروەها ئە درختەش كە ( طلح ) كە لە دونیا دا تەنها چاوەروانی سیبەركەی لی دەكریت ، لە بەهەشت بەرو بوومی چرو پری بە تام جۆراوە جۆری هەیە دەبەخشیت ، ئەی ئەو درختە دە بیت جۆن بیت كە هەر لە دونیادا بەروبوومی بەتام بەلەزەتی بەچیژی هەیە ، بە شیوەیە ك ئەو درختانەی كە بەرهەم دارە لەدویندا لە مالی نعیم یان بەهەشت ( ٧٠ ) جۆر لە تام وچیژ دەبەخشیت یان ( ٧٠ ) جۆر تامی هەیە ، وەك ( درختی خورما درختی سیو درختی هەنار درخی مۆز درختی تری ...هتد بەلی لبە هەشت دا جۆری رەنگ تام و چیژی جیاواز دەبەخشن ، بەلی ئەمانە لە بەهەشتدا نەچاو بینیویەتی نە گویی بیستیویەتی ،نەبەسەر دلی هیچ كەسیك دا هاتووە ، لە ( خوای گەورە ) دەپارینەوە بە میهرەبانی خۆی لە میوە میوەجاتە و خۆشیە كانی بەهەشت بی بەشمان نەكات ..!!

بەلی بی گومان درختەکانی مالی نعیم یان بەهەشت هەموو کات بەرهەمیان هەیە هیچ کات بی بەرهەم نین وەك درەختەکانی دونیا لە وەرزەکان بەرهەمیان هەبیت ، بەلکو درختی بەهەشت هەمووکات بە بەرهەمە سەوز چر پرە جیاوازیان زۆرە لە گەل درەختی دونیا دا ،هەروەها بەردوام سیبەریان هەیە بۆ هەمیشە ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا﴾الرعد ٣٥ .واتا: وینەو نموونەی ئەو بەهەشتەی بەلین دراوە بە ئیمانداران وپاریزکاران کە جوان و رازاوەیە چەندەها رەوان و جاریە بەژیر درختەکانی و بە ردەم کۆشکەکانیدا ، وە خورادنو خواردنەوەی هەمە جۆر و هەمەرەگی بەردەوامە هاوری لەگەل سیبەری خۆش و هەوای سازو شنەی شەمال ..!!

بی گومان خۆشیە کانی مالی نعیم لەوەدا کە ئەو بەروبومانەی هەن لە بەهەشتدا نە بەچاو بینیو یانە لە رەنگ بۆن وتام چیژەکەی دا بەلی بی گومان تام رەنگ بۆنیان جیاوازە لە تام رەنگ بۆنی دونیادا ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ كُلَّمَا رُزِقُوا مِنْهَا مِنْ ثَمَرَةٍ رِزْقًا قَالُوا هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِنْ قَبْلُ وَأُتُوا بِهِ مُتَشَابِهًا وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾البقره ٢٥ .

واتا: ئەی پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) مژدە بدە بە وانەی کە باوەریان هیناوە و کارو کردەوە چاکە کانیان ئەنجامداوە بەوەی باخەکانی بەهەشت کە چەندەها رووبار بەژیر درەخت و بەناو باخەکانیدا دەروات ، بەراستی بۆیان ئامادەیە ، هەر کاتیك لە میوەو بەرهەمیکی ئە باخانەیان بۆ دەهینن ،دەلین : ئیستا لەوە تان بۆ هینایـن ،تاویك لەوەو پیش لەوە میوەیەمان خوراد ، هەر دەیهینن و لەیەکتریش دەچن ، لەرەنگ و روالەتدا ، بەلام لە تام وبۆندا زۆر جیاوازن هەروەها لەویدا هاوسەرانی پاك وبی گەردیان بۆ ئامادەکراوە ئەو بختەورانە ،ژیانی هەمیشەیی و نەبراوە لە بەهەشتدا دەبە نە سەر بۆ هەمیشە ..!!

**درختەکانی مالی نعیم لق و گەلاکانیان ریك پیك بەرز بۆتەوە زۆر بەجوانی بە پوختی دیمەنیکی زۆر جوان دەبەخشن بە بەهشتیەکان چونکە ئەواندە جوان رازاوە لق گەلاکانیان بەرز بۆتەوە ..!!**

**هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ (٤٦) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (٤٧) ذَوَاتَا أَفْنَانٍ﴾**الرحمن ٤٦-٤٨ .واتا: بۆ ئەو کەسانەش کە لە مقامی پەروەدگاری خۆی ترسابییت ، دوو باخی رازاوەی بە هەشت ئامادەیە بۆی ..!!جا ئیتر گرۆی ئادەمیزادو پەری بە کام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگار بروا ناکەن کامەی پەسەند ناکەن ..!!ئەو دوو باخەش خاوەنی دارو درەختی گەلای ناسك و جوان بریسکە دارە ..!!**

**هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿وَمِنْ دُونِهِمَا جَنَّتَانِ (٦٢) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (٦٣) مُدْهَامَّتَانِ﴾**الرحمن ٦٢-٦٤ .واتا: جگە لەو دوو بەهەشتەی کەباس کرا ، بەهشتی تریش ئامادەیە بۆ ئەوانەی کە پلە و پایەیان وا لە خوار یان لەژێر خاوەنی دوو بەهەشتی ناوبراوە وە ..!! جا ئیتر گرۆی ئادەمیزادو پەری بە کام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگار بروا ناکەن کامەی پەسەند ناکەن..!! ئەو بەهەشتانەش واتا: ( مد هامتان ) ئەوە ندە سەوز کەسك ، دەنوینن مەیلە و رەش دچنەوە لەجوانی و تۆخیدا ..!! بی گومان بەهەشت درەختەکانی سەوزە بەلام لەبەر گەورەیی چرو پری درختەکان خۆی بە مەیلەوە رەش باوە نیشان دەدات ، ئەمەش دیمەنیکی زۆر جوان سەرنجراکیشی هەیە بۆ خاوەنانەی ئە م باخانەی بەهەشت..!!بەلی بەرو بوومی ئەم دارانە ئەوەندە نزیك شۆر بوونەتەوە بەهەشتیەکان بەئاسانی دەستیان دەگاتی ..!!هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿مُتَّكِئِينَ عَلَى فُرُشٍ بَطَائِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ وَجَنَى الْجَنَّتَيْنِ دَانٍ﴾**الرحمن ٥٤ . واتا: لەو بەهەشتە خۆشەدا لەسەر کورس و قەنەفەو جیگەو ریگەی خۆشەکان ، پالیان داداوە کەلە ئاوریشمی تایبەنت ناوازە کراوە ،( داخۆ بەرگەکەی لەچیە ؟! ) لیکردنەوەی هەر میوەیەکیش نزیك و ئاسانە و درختەکان خۆیان سەر فر دەهینن بۆئە بەختەوەرانە ..!!هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَالُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا﴾**الانسان١٤. واتا: سیبەری درختەکان جوانەکان بەسەر شوینە خۆشەکانیاندا سەری فرو هیناوەو لی کردنەوە میوە کانیش ئاسانە و لکەچ کراوە .!!**

هەندیك لەو فەرموودانەی کەباسی دار درخت و باخەکانی مالی نعیم

١-لە (ابو هريره ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : (( إن في الجنة لشجرة سير الراكب في ظلها مائة عام )). حديث صحيح رواه الترمذي باب في صفة الجنة برقم ٢٥٢٣ . واتە :بی گومان بەهەشت درەختی وا تیدایە سوارچاك (١٠٠) سەد سال بە سیبەرە کەیدا دەروات بی ئەوەی ببریت ..؟!

٢-لە (ابی سعید خدری ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : (( فی الجنە شجرة يسير الراكب في ظلها مائة عام لا يقطعها وقال : ذلك الظل الممدود )). رواه الترمزي باب وصف الجنة برقم ٢٥٢٤ . واتە : بی گومان بەهەشت درەختی وای تیدایە سوار چاك (١٠٠) سەد سال بە سیبەرەکەیدا دەروات بی ئەوەی بیبریت ،وە فەرموی : ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ﴾الواقعة ٣٠.
واتا: لە ژیر سیبەری بەردەوام و دوو روو دریژدان ..!!

٣-لە(ابو هريره ) – خوا لی رازی بیت – دە لیت : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرموویەتی : (( ما في الجنة شجرة إلا وسقها من ذهب )) حديث حسن غريب رواه الترمذي باب في صف الجنة برقم ٢٥٢٥.

واتە: هیچ درەختیك لە بەهەشت نیە قەدەکەی لە زیر یان ئالتوون نەبیت ..؟!

٤-درەختی (سدرالمنتهى ) کە (خوای گەورە ) باسی کردووە دەفەرموویت : ﴿عِندَ سِدْرَةِ الْمُنتَهَىٰ﴾النجم ١٤. بەلی (سدر المنتهى ) ئەو درەختەیە کە خوای گەورە هەوالی پی داوین ، کە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە لای ئە درختەدا جبریل بە شیوەی خۆی بینی و کە (خوای گەورە ) بەدیهیناوە ، هەروەها پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) لە بارەی ئەم درختەوە ئەم باسانە دەفەرمووی : (( ثم رفعت لي سدرة المنتهى ،فإذا نبقها مثل قلال هجر ،وإذا ورقها مثل آذان الفيلة ،قال :- أي جبريل – هذه سدرة المنتهى ، إذا أربعة أنهار ، نهران بطنان ونهران ظاهران ،فقلت ما هذان يا جبريل؟! قال : اما الباطنان فنهران في الجنة ،واما الظاهران فالنيل والفرات )). متفق عليه رواه البخاري ومسلم .

واتە: سدر المنتهى بۆ بەرز کراویەوە ئینجا (بقەکە یان بەروو بوومەکەی وەکو (قلال هجر ) بوو ، وە گەلاکانیشی وەکو گویی فیل بوو ، جبریل فەرمووی : ئەمە سدرالمنتهى یە ، وە چوار رووباریشم بینین ، دوو رووباری نادیار دوو رووباری دیار ووتم : ئەوامەچین ..؟! جبریل فەرمووی : دوو رووبارە نادیارە کە دوو رووباری بەهەشتن ..وە دوو رووبارە دیارەکەش رووباری نیل رووباری فوراتن ..!!

هەروەها لە روایەتیکی تریش لە هەردوو صحیحی بوخاری و مسلم دا هاتووە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : (( ثم انطلق بي حتى انتهى الى سدرة المنتهى ، وبقها مثل قلال هجر ، ورقها مثل اذان الفيلة ، تكاد الورقة تغطى هذه الامة ،فغشيها الوان لا ادري ما هي ، ثم ادخلت الجنة ، فاذا فيهاجنابذ اللؤلؤ ، وذا تربها المسك )). رواه الصحيحين . واتە : ئینجا لە گەل جبریل کەوتم تا من ی بردە لای درختی سدر المنتهى ، نقبها یان بەرهەمەکەی وەکو ( قلال هجر ) بوو گەلاکانی وەکو گویی فیل بوون ، هەر گەلایەکی یان پەلکیکی نزیك ئەو ئوممەتە دادەپۆشیت ، جا رەنگاو رەنگیکی بەسەر دا هات و دای پۆشی نەم زانی چیە ؟ پاشان چوومە ناو بەهەشت گردۆکەیەك یان کوپەلەیە کی مراوای تیدا بوو ، هەروەها خاکەکەشی یان خۆلە کەشی میسك بوو ..!!

٥-درەختی ( طوبا ) یان داری ( توبا ) ئەمەش درەختیکی گەورە و مەزنە ، کە لە ( ابو سعيد خدرى ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت ك پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویە تی : (( طوبي شجرة في الجنة ، مسيرة مائة عام ،ثياب اهل النجة تخرج من اكمامها )). صحيح الجامع الصغير ٨٢/٤ .

واتە : بەهەشت ( ١٠٠ ) سەد سالە رییە ، جل وبەرگی خەلکی بەهەشت لە خونچە کانیانەوە دەر دەچیت ..!!

وادیارە جل و بەرگی خەلکی بەهەشت لە بەرو بوومەکانی بەهەشت دا دروست دەکرین ..!!

٦-رووەکی رەیحان ، کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّةُ نَعِيمٍ﴾الواقعه ٨٩.

واتا: روحی کی پاك و بیگە ریحانیکی بۆن خۆش ، لە بەهەشت دا بەکامەرانی و ئاسودەیی پر لە نازو نیعەتی ناوازە چاوەرییە تی ..!!

٧-چۆن ئیماندار بەشی خۆی لە درەختەکانی مالی نعیم دا زیاد دەکات

پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرموویەتی : (( من قال : سبحان الله العظيم وبحمده غرست له بها نخلة في الجنة )). صحيح الترمذي كتاب الدعوات برقم ٦٤٢٩ .

واتە : هەر کەسیك بلی: ( سبحان الله العظيم وبحمده ) ئەوا لە بەهەشتدا دار خورما یەك دەچینیت ..!!

## دووانزەم :کۆشك و باڵەخانە کان و چادرو خیوە تە کان و ژوورە کانی  ماڵی نعیم

( خوای گەورە ) لە بەهەشتی  پان و بەرین فەرەواندا ،  وەك چۆ لە ژیانی دونیادا مرۆڤەکان خەریکی بنیات نانی کۆشك و خانووبەر قەصرو باڵە خانەی بلندو بەرزو قڵای جوان نەخشینراوە ، کە مرۆڤ خۆی تیدا بەخت دەکان لە پیناویدا زۆر ماندوو هیلاکە ،بە ئاواتی ئەوەیە کە لە کۆشکیك یان خانوویە یان باڵە خانە یەك بژیت جا ئەوەی بەر حلال دەستی دەکەویت زۆر ئاسوودەو بەختەوەر بۆ ماڵە کەی ئەوەشی بەحلال دەستی دەکەویت دیارە زۆر نارەحەت دەژی لە ناوئەم ماڵە دا ، هەر بۆیە دەبیت بەندە خوا بیرك بکاتەوە بۆ ئەو ماڵە بۆ هەمیشەیی تیدا دەژیت کە ماڵی نعیم  و ماڵی هەتاهەتایی هەموو مرۆڤەکانە ،جا ئەوە یە جۆن بۆ مەنزلگای شوینی نیشتەجی بوون یان نیشنگە دونیا هەولی بۆ ئەدەیت زۆر بە جوانی دەی رازینیەوە ، خۆت ماندوو دەکەیت بۆ ئەوەی قاتیك یان پایە یەك بەرز کەیتەوە یان ئەوە تە بەجوانترین شیوە نەخش ونیگاری جوانکاری بە گرانبە هاترین شتی یان بەردی بەنەرخ لە زەویە  دا دەیرازینەوەبۆ ئەوەی تیدا  بحەویتەوە ،کەچی لە چاو تروکانیکدا ئەم ماڵە ویران دەبیت هەر شوینی نامین لە دەستی دە دیت ،ئیمە با  پرسیار لە خۆمان بکەی بۆ ئەو ماڵەی کە ( خوای گەورە  ) بۆ ئامادە کردوین لە ماڵی نعیم یان بەهەشتدا بۆ هەمیشەیی تیدا دەمینەوە ، کە ئەم ماڵە نەك  (١٠٠) مەتر بیت زەویەکە یان (٥٠٠) یان (١٠٠٠) مەتربیت ،بەڵکو بە هەزاران کیلومەتر یان ئەوە تا چاو حکم دەکات ئەوا ئەوگەورە فرەوانی ئەم ماڵیە کە تیدا بۆ هەمیشەیی دەژیت ،ئەی بۆ بیر لەم ماڵە ناکەینەوە کە خشتیك لە زیر و خشتیك لە زیو یان لەنیوان خشتە کانیش یاقوت مرواری و مرجان یان بۆنی میسك کە (٤٠) ساڵە ری دەروات ، ئیمە لەژیان دا دەبینین  کەسیك دەڵین مەزرعەی هەیە ئاوی هەیە هەندی درخت باخی هەیە ، پی دەڵین بەخوا ژیانیکی خۆش بەسەر دەبات ، بەڵام بی گومان ئەمەژیانی مردنە لە چاو ماڵی نعیم یان بەهەشت ئەو ماڵە کەتیدا دەژیت ،جۆرە باخە و باخات کانی رووبار بەژیر دەرختەکانی ئەم ماڵەی بەهشت دادیت چەندەها دروختی بە بەرووبوم وبەرهەمداری هەیە کە هەریەکیکیان جەندەها بۆن تام چیژی جیاوازی هەیە هەریەك لە میوە کان جەندها رەنگ و بۆن تام و چیژی جیاوازی هەیە یان ئەوتا وەك فرۆکە وولاغ لە بەردگای ماڵە کەی دایە کەباڵە کانی سورە یاقووتن بۆ هەر کوی ئارەزوو بکەی دەروات و دەفری ، ئەمەیە ماڵی نعیم کە دەبیت بە ناسینی خوای گەورە ترسان لەو زاتە خۆپاریزی لەخرا پە کاری شەونخونی و نزاو پارانەو یادی خوا ،بیر کردنەوە لە نیعمەتەکانی خوا بەرز و بلند کردن و راگرتنی  ووشەی (لا إله إلا الله محمد رسول الله ) ئەم ماڵە بەدست دەهینین ،خوادیە بە ماڵی نعیم شاد و بەختەورمان بکە ..!!

هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾التوبە ٧٢ . واتا : ( خوای گەورە ) بەڵێنی داوە بە ئیماندارن لە پیاوان و لە ئافەرتان ، بەوەی کە باخەکانی بەهەشتیان پی دەبەخشیت کە چەندەها رووبار بەژێر درەختەکانیدا دەروات و جاریە بە بەردەم کۆشکەکانیاندا ،هاوری لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبراوە تیایدا ،هەروەها چەندەها جیگەو ریگەو کۆشك و تەلاری خوش و رازاوەی تایبەتی لە بەهەشتدا و لەناو باخی چر وپری ( عدن ) دا لەگەڵ رەزامەندی ( خوای گەورە )دا کە لە هەموو نازو نیعمەتەکان بەنرخترو گرنگترە ، ئەوە خۆی سەرفرازیەکی زۆر گەورە و بی ندازەو بی وینەیە ..!؟

بەلی ( خوای گەورە )لە زۆر شوینی قورئاندا ئەم مالەی بە ( غرف یان غرفات ) ناو بردووە هەروەك دەفەرمەوویت : ﴿وَهُمْ فِي الْغُرُفَاتِ آمِنُونَ﴾سبا ٣٧ . واتا : ئەوانیش لە کۆشك و تەلارەکانی بەهەشتدا بە ئاسوودەیی و ئارامی و خۆشی ،ژیان دەبەنە سەر ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرمەوویت : ﴿أُولَئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَامًا﴾الفرقان ٧٥ . واتا : ئەو جۆرە کەسانەی کەباس کران پاداشتیان ژوورە رازاوە و بەرزو خۆشەکانی بە هەشتە لەبەرامبەر خۆگرتن و ئارامگرتنیانەوە جا لەوی بە سلاو و درووود پیشوازیان لیدەکریت بۆ هەمیشە دەحەوینەوە تیایدا ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) وەسفی ئەم غرفانە یان ژوورانە دا دەفەرمەوویت : ﴿لَكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِنْ فَوْقِهَا غُرَفٌ مَبْنِيَّةٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ الْمِيعَادَ﴾الزمر ٢٠ . واتا: بەلام ئەوانەی کە لە پەروەدگاریان دەترسان و دیندار بوون کۆشك و تەلاری چەند تابق یان نهۆم کە ژوورە کانی لە سەر یەکن بۆیان ئامادەیە ، چەندەها رووبار بەژێر بە بەردەم ئەو کۆشکانەدا جاریە ئەوەش بەلێنی خوایە ، بی گومان خوایش بەلێنی خۆی دەباتە سەر ..!!

هەروەها ( ابن کثر ) دەلیت : ئەو ژوورانەی بەهەشت وە کۆشك بالە خانەو قەصر و قصور وان ، نهۆم نهۆمن یان طابق طابقن چین چین لەسەر یەکن هەر هەموو نهۆمەکان لەژێرەوە چەسپاون بە نەخش و نیگای جوان رازاونەتەوە ..!!

هەروەك پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی: (( إن في الجنة غرفا يرى ظاهرها من باطنها ،وباطنها من ظاهرها ، قال ابو مالك الاشعري : لمن هي يا رسول الله ..؟! قال : أعدها الله تعالى لمن أطعم الطعام الأن الكلام وتابع الصيام وصلى بالليل والناس نيام )).رواه احمد .

واتە : لە بەهەشتدا كۆشك و تەلارو بالە خانەی بەرز هەن لە ناوە وە دەری دیارە ، لە دەرەوە ناوەوە دیارە ، هەروەها ( ابو مالك الاشعری ووتی : ئایا ئەم كۆشك تەلارانە بۆ كی یە ..؟! ئەویش فەرمووی : بۆ ئەو كەسانەیە كەلە پیناوی خوادا نان دەبەخشن ، وە قسەی نەرم نیان دەكەن ، وە لە رۆژوو گرتن بەردەوامن ، شەو نویژ دەكەن لەو كاتانەی خەلك نوستووە ..!!

هەروەها جگە لە كۆشك تەلاور بالە خانەو ژوورە كان لە بەهەششتدا خیوەت و چادریش هەن كە ( خوای گەورە ) باسی دەكات دەفەموویت : ﴿حُورٌ مَقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ﴾الرحمن ٧٢ .

واتا: حوری چاو گەشەكان یان چاورەشەكان لە چادر خیوتەگەیە تاییەتیانەی كە بۆیان ئامادە كراوە دوور ناكەونەوە ..!! بەلی ئەم خیوتانە زۆر سەیر و سەرمەرەن ، جیگای سەر سور مانە!! چونكە لە مرواری یاقووت پیكاتوون بەرزیان بەرەو ئاسمان ( ٦٠ ) میلە و ، لە هەندیك روایەتی تردا دە گیرنەوە بەرینیا ( ٦٠ ) میلە ..؟! هەروەك لە ( عبدالله ی كوری قیس ) دا هاتووە – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( إن الخيمة درة مجوفة طولها في السماء ثلاثون ميلا ، وفي كل زاوية منها للمؤمن اهل لابراهم الاخرون )).صحيح البخاري كتاب بدء الخلق ،باب صفة الجنة فتح الباري ٣١٨/٦ . واتە :خیوتەكە بە مرواری یان یاقوت دروست كراوە بەرزیە كەی یان دریژەیە كە ی بەرەو ئاسمان ( ٣٠ ) میلە لە هەر گۆشەیەدا ئەهلی ئیماندار هەن ،كە كەسانی تر نایابینین ..!!

هەروەك لە ریوایەتیكی تردا هاتووە (( إن المؤمن في الجنة الخيمة لؤلؤة واحدة مجوفة طولها ستون ميلا ،للمؤمن أهلون يطوف عليهم المؤمن ،فلا يرى بعضهم بعضا )). بەلی لەم روایەتە دا فەرموویەتی ( بەرزی یان دریژی ( ٦٠ ) میلە ..!!

هەر لە روایەتیكی تریش دا هاتووە فەرموویە تی : (( فى الجنه خمية من لؤلؤ مجوفة عرضها ستون ميلا في كل زاوية منها اهل ما يرون الاخرين ،يطوف عليهم المؤمن )) رواه مسلم .

دیارە لەم راویەتەدا دەلی پانیەكەی یان فراوانیەكەی ( ٦٠ ) میلە .

هەروە ها لە فەرموودەیەکی ترمزی دا هاتووە لە ( علی ) – خوا لی رازی بیت – دە لی : پیغەمبەری خوا ( صلى الله علیه وسلم ) فەرمووی : (( إن في الجنة لغرفا ترى ظهورها من بطونها من ظهورها فقام إليه أعرابي فقال : لمن هي يا رسول الله ..؟! قال : هي لمن أطاب الكلام وأطعم الطعام ، وأدام الصيام ،وصلى الله بالليل والناس ينام )) رواه الترمذي هذا حديث غريب .برقم ٢٥٢٧ .

واتە : لە ( علی ) – خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا ( صلى الله علیه وسلم ) فەرمووی : بەهەشت ژووری وەها تیدایە لە دەرەوە ناوەوە دەبینی ، لە ناوەوە دەرەوە دەبینی ، عەربیکی دەشتەکی هەستایەوە ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله علیه وسلم ) ئەو ژوورانە بۆ کی دەبیت ..؟! ئەویش فەرمووی : بۆ ئەو کەسەی کە قسە و گوفتاری نەرم نیانە لە گەل خەلکدا ،وە خواردنی هەژاران دەدات یان نانی دەدات بەهەژاران و لی قەوماوان ، یان ئەو کەسەی زۆر بەرۆ ژوو دەبیت ، هەروەها ئەو کەسەی کە نویژ دەکات بە شەو لە کاتیك دا خەلك هەمووی نووستون واتە شەو نویژ دەکات ..!!

بەلی لەم سەردەمە دا کە سەردەمی خۆ هەلکیشان خۆ بە گەورە زانین شهوەت بازیە ئارەزووی زۆری مالی دونیایە کەچی هیچ کات بیر ناکەنەوە لەوەی کە ئەم خۆ هیلاك کردنەوە ماندووبوونە بۆ قیامەت بیت نە بۆ رازانەوەی مالەکانی دونیا ،کە لەم سەردەمەدا دەبینین ، بەناوی مۆدیل و مۆدیل کاری کۆشك تەلار وبالە خانەکان دەرازینەوە بۆ ماوەیەکی کورت کەم هیچ گویی بەقیامەتی خۆیان نادەن یادو زکری خوای گەورەیان لەبیر کردووە لەبەر تەماعی مالی دونیادا بیر لەو مالە هەمیشەیە ناکەنەوە کە خوای گەورە بەلینی پیداوین بۆ هەمیشەیی تیدا ژیان بکەین ، کەچی مالی دونیا وەك سراب وایە دی و دەروات ماوەیەکی کەمە ژیان بەکۆلەمەرگی تیدا بەسەر دەبەن ئەگەر پاشاو ملیك و فەرمانرەوای هەموو جیهانیش بیت هەر دەبیت بمری ..!! هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾الانبياء ٣٤ . واتا: هەموو کەسیك دەبیت مردن بچیژیت و شەرابی مەرگ بنۆشیت ، بی گومان ئیمە ئیوە تاقی دەکەینەوە بە شەڕو ناخۆشی و بەلاو بەخیرو خۆشی ودارایی و توانایی ، سەر ئە نجام هەر بۆ لای ئیمە دەهینرینەوەتا پاداشتان بدەینەوە ..!!

بەلی کی هەیە لە ئیمە دا کە مالی نعیم بۆ هەمیشەیی نەیەویت ..؟!، بی گومان هەر هەموو گرۆی ئادەمیزاد حەزی پی دەکات دەیەویت ، بەلام ئادەمیزاد ئەوەندە هیلاکی دونیایە ئەوەندە هیلاکی قیامەتی خۆی نیە ، هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت: ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ (١٠) الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ المومنون ١٠-١١ . واتا : ئەوانەی میراتگری یان خاوەنی مولکی بەهەشتن ، بەلی هەر ئەوانە دەبنە خاوەنی بەهەشتی فیردوسی بەرزترین بلند ترین و بە نرخترین بە هەشت بۆ هەمیشە ژیانی تیادا دەبنە سەر لەو پەری گەنچایەتی ولاویەتی و تەندروستی باش ئاسوودە ژیان دەبەنەسەر ..!!

بەلی بی گومان ئەو کەسانەی خاوەنی مولك و کۆشك و بالە خانە و تەلاری بەرزو فیردس بەرزو بلند و خیوتەگەو ژوورەکانی مالی نعیم بیت ، دەبیت چەند سیفاتیك هەیە کە لەو کەسانە دا بیت وەك رەوشتیکی ئیمانداریکی دامەزراوی سەرفرازی سەرکەوت ، لەسەر بەرنامەکەی ( خوای گەورە ) پیغەمبەرە کە ی( صلی الله علیەوسلم ) خزمەت کردنی ئەم ئاینە پیرۆزە لە ریگای بانگەوازی خۆ بەخت کردن چاکە کاری و ئە نجامدانی فەرمانەکانی خوا وەك : توحید یەکتاپەرستی بەئیمانیکی خالص و دامەزاو کە چەندین کردەوەی تر کە خوای گەرە رەزامەندە لەسەری بۆ ئیمانداران ، دەبیت ئەم سیفەتانەی تیدا بیت ئینجا خاوەنی فیردوسی بەرزو بلندە هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ (١) الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ (٢) وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ (٣) وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ (٤) وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ (٥) إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ (٦) فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ (٧) وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ (٨) وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ (٩) أُولَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ (١٠) الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾المومنون ١-١١

.**سیفەتی یەکەم : دەبێت باروەو ئیمانی هەبێت بە ( خوای گەورە ) و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم )**
**ئەوا سەر کەوتوو سەرفراز دەبێت هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿: قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ﴾.**

**سیفەتی دووەم :ئەوکەسانەی دلیان ئامادەبێت بۆ نوێژ کرد بەشێوەیەکی جوان ڕیك پێك نوێژەکانیان ئە نجامدەدن وە بەخشوع و بەدل هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەر موویت : ﴿الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾ .**

**سیفەتی سی یەم : ئەوسانەی قسە و گوفتاری نابەجی ناکەن یان قسەو کرداری بی سوود و بی کەلك ، تەنها قەسەو کرداریان بە زکرو یادەی خوا بەسەر دەبن وە نوێژەکانی بە خشوع ،ناچنە کور کۆمەلیك کە سوودی قیامەتیان بۆ نەبێت دوور دەکەنەوە لەم گوفتارە نابەجی یانە ، هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت ﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ﴾.**

**سیفەتی چوارەم : ئەو کەسانەی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) جی بەجی دەکەن لەژێر فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی دەرناچن ،زکاتی مالی خوا بەباشی دەدەن بە ئیمانداران موسلمانەهەژارەکان بەبی هیچ کەم وکوریەك زەکات دەدەن بەبی ئەوەی پیان ناخۆش بێت فەرمان جی بەجی دەکەن هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ﴾.**

**سیفەتی پێنچەم :** ئەو کەسانەی داوێنی خۆیان بە پاکی رادەگرن ،وە دەپارێزن لە هەر کارو کردەوەیە کی قێزەون و ناشەرعی ، بەدوای شەهوەت بازی دا ناگەرێن دوور دەکەونەوە لە بەد رەوشتی و داوێن پیسی زینا کرد و نێربازی و نەزەر کردن وتێروانینی ئافرەتەی نامەحرم ، خۆیان دەبارێزن هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ﴾

**سیفەتی شەشەم :** ئەو کەسانەی ئەمانەتی خەلکیان پاراستوە وەك قسەیەك یان شتێك یان پاراستی ئەمانەت ئێتر ئەمانەتی خێزان بێت یان کەلە دائیرەیەکی حوکمەت دابی دەبێت بە عدل و یەکسانی و داد پەروەی ئەم ئەمانەتەبپارێزی یان خیانەت ودزی لی نەکەیت ،یانەئەوکەسانەی خاوەن عهد و بەلێنی خۆیانن لەئەمانەتداری دا ، هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ﴾.

**سیفەتی حەوتەم:** ئەوکەسانەی پارێزگاری دەکەن لە نوێژەکانیان بەهیچ شێوەیەك نوێژەکانیان نافەوتێنن وە بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾.

بەلی بی گومان ئەو حەوت سیفەتەی سەرەوە کەباسمان کرد ئەمانە خاوەنی مالی نعیم یان بەهەشت یان فیردوسی بەرزو بلند ئامادەیە بۆ یان کە مالیکی هەمیشەیی بۆ هەتاهەتایی ئامادەکراوە بۆئەو کەسانەی ئە م سیفەتەجوانانەیان هەیە انشا الله ئەوانەی نیەت واخلاصیان تەنها بۆ رەزامەندی خوای فیردوسی بەرزو بلند بەقسمەتیان بێت خودایە ئیمەش یەکیك بین لەو سیفەتەجوانانەی کە خوای گەورە بۆ مانی باس کرد ،خاونی مالی فیردوسی بەرزو بلند و جوان دل رفینە ..!؟

کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ (١٠) الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ المومنون ١٠-١١

واتا : ئەوانەی میراتگری یان خاوەنی مولکی بەهەشتن ، بەلی هەر ئەوانە دەبنە خاوەنی بەهەشتی فیردوسی بەرزترین بلند ترین و بە نرخترین بە هەشت بۆ هەمیشە ژیانی تیادا دەبنە سەر لەو پەری گەنچایەتی ولاویەتی و تەندروستی باش ئاسوودە ژیان دەبەنەسەر ..!!

هەروەها پیەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باسی هەندیك لەو كۆشك تەلارو بالەخانانە دەكات كەئامادەكراوە بۆ هاوەلانی بەریزیی ، بەلی بی گومان شایستەی ئەم مال كۆشك و خانوو بالە خانەنی بەهەشتن ، چونكە ئەم ئیسلامەیان گەیاندە ئەم رۆژە بە بانگەوازی كردن بۆی خەبات و تیكۆشان لە پیناوی رەزامەندی (خوای گەورە) ئەم ئاینە پاكە و بیگەردە یان گەیان بە گوی كرۆ ئادەمیزاد (خوای گەورە) لە هاوەلانی پیغەمبەری خوا رازی بیت جیگاین مالی فیردوسی بەرزو بلند بیت ..!!

هەروەكو (مجاهد) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : هیچ بەندەیەك نیە كە دوو مەنزلگای بۆ ئامادە نەكریت ، یان ئەوەتا شوین و مەنزلگای لە بەهەشتە ،یان ئەوە تا شوین و مەنزلگای لە دۆزەخ دایە ،وە ئەوكەسەی كە ئیماندارە بنیاتی مەنزلگایەك یان كۆشكیك بۆ خۆی بنیات دەنی لە بەهەشتدا ، یان ئەوەتا مەنزلگایە ك یان شوینك بۆ خی ئامادەدەكات لەدۆزەخ دا ، كافران دوور دەكەونەوە ئەو مالەی بەهشت دەرووخینن بەدەستی ناهینان بنیاتی نانین ، هەروەها دەچن مەنزلگایە ك بنیات لە ئاگری دۆزەخ بنیات دەنین ..!!

هەروەك لە (ابو هريرە) وە – خوا لی رازی بیت – دەلی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : (( قال : الله تبارك وتعالى .أعددت لعبادي الصالحين ما لا عين رأت ولا أذن سمعت ولا خطر على قلب بشر )). رواه مسلم واتە :خوای گەورە تبارك وتعالى : ئەم بەهەشتەی ئامادەكردووە بۆ بەندە صالحەكانی ، كە نەچاو بینیویەتی ، نە گویی بیستیویەتی ، نە دلی هیچ مرۆڤیك دركی پی كردووە ..!!

لە (ابو هريرە) – خوا لی رازی بیت – دەلی : جبریل هاتە لای پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پی فەرموو: (( يا رسول الله ،هذه خديجة قد أتت معها إناء فيه إدام وطعام ،فإذا أتتك فاقرا عليها السلام من ربها ومني ،وبشرها ببيت في الجنة من قصب ، لا صخب فيه ولا نصب )). مشاكاه مصابيح ٣/٢٦٦ واتە : ئەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوا خەدیجە هاتووە دەفریكی پی یە خۆراك پی خۆری تیدایە ،جا كە هاتە لات سەلامی پەروەرگاری و هی منی پی راگەیەنەوە ،موژدەی بالە خانەیە یان

كۆشكیك لە قامیش دروست كراوی بەهەشتی بدەی، نە ژاوە ژاوی تیدایە نە ماندوو بوون ..!!

له هەردوو صحيح داهاتووه له( جابره ) وه – خوا لی رازی بیت – ده لیت : پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( دخلت الجنة فإذا أنا بالرميصاء امراة ابي طلحة وسمعت خشقة فقلت : من هذا فقال : هذا بلال ، ورايت قصرا ، بفنائه جارية ، فقلت : لمن هذا ؟! فقالوا : لعمر بن الخطاب ، فأردت أن أدخله فأنظر إليه ،فذكرت غيرتك ،فقال عمر : بأبي وأمي يا رسول الله أغار )). الصحيحين البخاري ومسلم .

واته : چوومه بەهەشتەوه چاوه به ( رمیصای خیزانی ابو طلحة ) کەوت ، وه گویم له خشپەیەك بوو ، ووتم ئەوەکیه ؟! ووتی : ئەو بیلاله ، کۆشکیکیشم بینی که نیزەیەکی له حەوشەکەی دا راوەستا بوو ، ووتم : ئەوه بۆ کی یه ..؟! ووتیان : بۆ عمری کوری ختابه ،چاویستم بچمه ناوی تەماشای بکه بەلام غیرتی تۆم بیرکەوتەوه ،ئینجا عمر ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دایك باوکم بەفیدات بی چۆن من غیرم بەرانبەر تۆ دەبیت ..!!

هەروەها پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەروویت: (( من بني الله مسجدا ولو كمفحص قطاة لبيضها بني الله له بيتا في الجنة )).في مسند احمد .

واته :هەرکەسیك مزگەوتیك بۆ خوا پەرستی بنیات بنی تەنها مەبەستی رەزامەندی خودا بیت ، ئەگەر هەنیدە هیلان قەتی یەکیش بیت ، که بۆ هیلاکەکانی چی دەکات ، له جیاتی ئەوه خودا کۆشکیکی بۆ بنیات دەنی له بەهەشتدا ..!!

هەروەها له ( ئوم حبیبه وه ) هاتووه – خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( من صلى فى اليوم والليله اثنتى عشرة ركعت تطوعا ،بني الله له بيتا في الجنة )).في مسند احمد . واته : هەرکەسیك له رۆژو شەویکدا دوانزه رکعات نویژس ( سوونەت ) ی کرد ، خودا له بەهەشتدا باله خانەیه کی بەرزو بلندی بۆ بینیات دەنی ..!!

بی گومان خەلکی مالی نعیم وەك پاشا ژیان بۆ هەمیشەیی بەسەر دەبەن هەروەك ( خوای گەوره ) دەفەروویت: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا﴾الانسان ٢٠ واتا:کاتیکیش به هەر لایەکدا چاودەروانی ئەوا هەر نازو نیعمەت باخ وباخاته کوشك تەلاری رازاوەیه نەبراوەیه بی ئەندازه جوان و بی وینەیه خاونی مولکیك که وەك پاشا یەکی گەوره ژیان بەسەر دەبیت خاونی هەمووخۆشی و نازو نیعمەتەکانی خوای گەورەی ،بی گومان دیمەنی جوان فراوانی بی سنوور بی ئەندازه لەریك پیکی ژیان دەکەیت ئای چەنده خۆشه بۆ ئەو کەسەی دەبیته براووه سەرفرازی قیامەت یان مالی نعیم ..!!

## نۆزدەهەم : یەکەم کەس کە دەچێتە مالی نعیم پیغەمبەری خوایە ( صلی الله علیه وسلم )

بەلی بی گومان یەکەم کەس کە دەچێتە مالی نعیم یان بەهەشتەوە ، پیش هەموو دروستکراوەکانی ( خوای گەورە ) ئەویش پیغەمبەری خوا( محمد بن عبدالله بن عبدالمطلب ) محمد مصطفی ( صلی الله علیه وسلم ) کە سەروەری مۆڤایەتی و پیشەوایی مرۆڤایەتی و ئازیز گلینەی چاو رۆشنایی چامانە ..!!

هەروەك لە ( ئەنسی کوری ملیك ) وە – خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : (( أن أول من يقرع باب الجنة )). اخرجه مسلم ( ٣٣١ ). واتە : من یەکەم کەسم کە تەقە دەدەم یان لەدەرگای بەهەشت دەدەم ..!! وە ( خوای گەورە ) فەرمانی کردووە کە یەکەم جار دەرگای بەهەشت بۆ پیغەمبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) بکریتەوە ،کەلە ( ئەنس کوری مالیك ) – خوا لی رازی بیت- دەلی : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : (( فيقول : بك امرت أن لا افتح لاحد قبلك )).اخرجه مسلم ٣٣٣ . واتە : فریشتەی دەرگاوانی بەهەشت بە پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەلیت : فەرمانم پیکراوە کە بۆ هیچ کەسی تری نەکەمەوە پیش تۆ دا ..!! وە هەروەها یەکەم ئوممەت کە دەچیتە بەهەشتەوە ئوممەتی ئیسلامە کە باشترین ئوممەتن وە ئوممەتی باشترین پیغەمبەرانن ..!! هەروەك لە ( ابو هريره )وە – خوالی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : (( نحن اول من يدخل الجنة )). اخر جه مسلم ٥٨٥/٢ . واتە : ئیمە یەکەم ئوممەتین کە دەچینە بەهەشتەوە ..!!

بەلی ئەو ( ٧٠ ) هەزار کەسەن کە دەچنە ناو بەهەشتەوە لە ئوممەتی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) کە ( خوای گەورە ) پەیمانی پیدا بوون ..!! هەر وەك ئەم فەرموودەیەی پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) وە لە ( جابره )وە – خوا لی رازی بیت – دە لی : پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) فەرمووی : (( فتنجو اول زمره وجوههم كالقمر ليله البدر سبعون ألفا لا يحاسبون ثم الذين يلونهم ... )) اخرجه ٣١٦. واتە: یەکەم کۆمە کە رزگاریان دەبیت دەچنە ناو بەهەشتەوە ، دەرووشاویە وەك مانگی چواردە ،ئەوان ( ٧٠ ) هەزار کەسن بی لی پرسینەوە دەچنە ناو بەهەشتەوە وە پاشان ئەوانی تریش بەدوایاندا دین ..!!

هەروەها پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) باسی چۆنیەتی ناو بەهەشتی کردووە کە هەندیکیان دەستی هەندیکیان گرتووە ،وە رووخسارییان درەوشاوەیە وەك مانگە شەوی چواردە دایە ، لە ( ابو هريره ) – خوا لی رازی بیت دەگێریتەوە دەلی : پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( اول زمرة ،تدخل من امتي سبعون ألفا بغير حساب متما سكون أخذ لإ بعضهم ببعض حتى يدخل ))اخرجه البخاري ٣٣٢٧،و مسلم ٣٧١ . واتە : یەکەم کۆمە لە ئۆمەتی من کە دەچنە بەهەشتەوە (٧٠ ) هەزار کەسە بەبی لیپچینەوە یان بەبی حیساب ،هەندیکیان دەستی هەندیکیان گرتووە تاوە کو هە (٧٠ ) هەزار کەسە کە هەموویان دەچنە بەهەشتەوە ..!! لەریوایەتیکی تر دا هاتووە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( لا اختلاف بينهم ولا تباغض ،قلوبهم على قلب رجل )). البخاري ٣٢٤٥ . واتە : هیچ جیاوازی رق کینە لەدلیاندا نیە ،وەك دەلی : دلی یەك پیاون ..!!

هەروەها لە ( عمرانی کوری حصين ) – خوا لی رازی بیت – دەگێریتەوەلە پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( قيل ومنهم ..؟! قال : ( النبي ) ( صلى الله عليه وسلم ) هم : الذين لا يكتون (يكتون : لاستعملون الكي ) ، ولا يسترقون ( لايسترقون : لا يطلبون من احد أن يقرا عليهم الرقية ) ، ولا يتطيرون ( لا يتطيرون : لا يتشاء مون ) و على ربهم يتوكلون )). رواه البخاري ومسلم .

واتە: ووترا : کێن ئەوانە ئەی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : کە داخ لە دل نین یان داخ بەکارناهینن ، وە داواش لە موسلمانان ناکەن کە دوعیان بەسەردا بخوینن یان رقیە ، وە هیچ شتێك بە شووم نازانن وەك فرنی بالندەئاژەلی ترە ، تەنها پشت و پەنایان بە ( خوای گەورە ) یە ..!!

## بیستەم :ئەو هەنگاوانەی کە دەچیت بۆ مالی نعیم

بەلی یەکیك لە تايبە تمەندیەکانی ئەم ئاینە پیرۆزەی ئیسلام ، ئەوەیە کە چەندەها ریگای هە یە بۆ گەیشتن بە مالی نعیم ، ئەویش خوا پەرستی بەتاك و تەنها ، دوور لە شریك و هابەش دانان بۆ خوای گەورە ، وە چەندەها عیبادەتی یان پەرستنی سووك وئاسان هە یە ، کە ( خوای گەورە ) و پیغەمبەرە کەی بۆ مانی دیار کردووە ، کە تیدا دە بیتە مایە پاداشتی زۆر گەورە ،کە خاوەنەکە زۆر بە ئاسانی ئەتوانی خەلاتی مالی نعیم یان بەهە شتی پان وبەرین بەدەست بهینیت ، بەو مەرجەی کە یەکتا پەرست بیت توحیدو یەکتا پەرستی بە بی شریك هاوبەش دانان ، و تەنها خوای گەورە بپەرستیت جگە لە خوا کەسی هیچ شت کەسی تر نە پەرستیت پەناو پشتی تەنها بە خوای گەورە بیت ، کە زۆر بە داخەوە زۆربەی موسلمانان غافل و بی ئاگان لە بە پاك پەرستنی خوای گەورە ، بەلی جا ئەو کردەوانەی یان ئە پەرستنانەی یان ئەو عیبادەتانەی کە باسی دەکەین هیچ گرانیە یان قورس نین بۆ خاوەنەکەی ئەوەی مەبەستی خوا پەرستیە یان مەبەستی هەنگاو نان بۆ مالی نعیم بۆ بەهشت ، ئەم عیادەتانە ئە نجام بدە ، کە زۆر سووك ئاسانن بۆ خاوەنەکەی ، بۆ ئەوەی هەنگاو بنیت بۆ مالی نعیم ، بەلی برای خۆشەویست خۆشکی بەریز ،ئایا دە زانیت مالی نعیم چاوەریتە ..؟! ئایا دەزانیت مالی نعیم بۆ تۆی ئیماندار ئامادە کراوە ، ئایا دەزانیت مالی نعیم مالیکی هەمیشەیی یە ..؟! بەلی ئەی برا و خوشکی بەریز ووریابە لە شنەبای فینکی بەهەشت یان مالی نعیم بی بەش نەبی..؟! لە خۆرو ئاوی سازگاری مالی نعیم بی بەش نەبی ..؟! لە سەوزایی دل رفیینی مالی نعیم بی بەش نەبی ..؟! لەجیگای ئارامی هیمنی مالی نعیم بی بەش نەبی ..؟! لە بۆن خۆشی بەرامی مالی نعیم بی بەش نەبی ..؟!لە بینی و دیداری ( خوای گەورە ) بی بەش نەبی ..؟! لە ژیانی پر لەخۆشی پاوەشی حوریە چاوگەشەکان بی بەش نەبی ..؟! بەلی برای خۆشەویست خوشکی بەریز بەهەشت چاوریتە..؟! بەلکو ئەو کەسانەی فەرمانبەرن یان کریکاری دەکەن یان بازرگانن یان دەسەلاتدارن ، یان هەر پیشەیەکی تریان هەیە ئەم پەرستانە زۆر سووك ئاسانن بۆ خاوەنەکە کەبی بەش نەبیت لە مالی نعیم ، فەرموو ئەم هەنگاوانەی خوارە بنین بۆ بەهەشتی پراو پر لە خۆشی شادی بەختەوەری کامەرانی هەموو بەندەیەکی خوای گەورە کە مەبەستی مالی نعیم بیت نەك مالی دوینا کە ساتیکی زۆر کەم تیدا دەباتە سەر ، بەلام مالی نعیم بۆ هەمیشە تیدا دەمینتەوە ..........؟!

**يەكەم : تێ كۆشان لە پێناوی خوادا :**

هەروەك پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : ((إن في الجنة مائة درجة أعدها الله للمجاهدين في سبيله كل درجتين ما بينهما كما بين السماء والأرض فإذا سألتم الله فسلوه الفردوس فإنه اوسط الجنة وأعلى الجنة وفوقه عرش الرحمن ومنه تفجر أنهار الجنة )) رواه البخاري برقم ٢٧٩٠ .

واتە : بەهەشت (١٠٠ ) پلەیە نیوان هەر پلە یەك بە قە د ئاسمان و زەوی دەبی ، ( خوای گەورە ) ئامادەی كردووە بۆ ئەوەی جیهاد تێ كۆشان دەكات لە پێناوی خوادا ،جا ئەوەی كە لە خوای دوادەكە ن دوای فیردۆسی بەرزو بلند بكەن ، كە نایاب ترین شوینە لە بەهەشتدا ، هەروەها ( عرش ) خوای گەورە لەسەرووی فیردۆسە كە چەندەها رووبار لە فیردۆسەوە هەلدەقولیت ..!!

**دووەم : خویندنەوەی قورئانی پیرۆز و لە بەر كردنی :**

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی : (( خيركم من تعلم القران وعلمه )) رواه البخارى برقم ٥٠٢٧ .واتە : باشترین كەستان ئەو كەسەیە كە خۆی فیری قورئان خویندن دەكان ، دواتر كەسی تریش فیری قورئان خویندن دەكات..!!

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم دەفەرموویت : (( يقال الصاحب القرآن إذا دخل الجنة : اقرأ واصعد فيقرأ ويصعد لكل آية درجة ، حتى يقرا ى خر شي معه )). صحيح ابن ماجه ( ٣٧٨٠ ) .

واتە : بۆ ئەو كەسەی كە خاونی قورئان خویندنە ،ئەگەر چوویتە بەهەشت ،قورئان بخوینەو بەرزبەوە پلەیەك ، بخوینەوە بەرزبەوە بۆ هەر ئایەتیك پەلەیەك بەرز دەبیتەوە لەبەهەشتدا ، هەتا كۆتای پەلە بە پلە بەرز دەبیتەوە بە هۆی قورئان خویندن ..!!

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( انما مثل صاحب القرآن كمثل صاحب الإبل المعقلة أن عاهد عليها امسكها وان اطلقها ذهبت )) رواه البخاري برقم ٥٠٣١ .

واتە : نموونەی قورئان خویندن وەك نموونەی خاون ووشتر وایە ، كە ووشترەكە بە بەنیك یان بەتیك ببەستیتەوە و ، بە مەر بەندی مەر بەندی كردبی ،چۆن ئەو ئەگەر سەرەو كاری ووشترەكەی بە لەسەر دەبی ولە دەستی دەرچی ،قورئانیش هەروەها . ئەگەر خاوەنەكی خەریكی بی و چاودیری بكا ، ئەوا لە بەری دەمینی ،دەنا بەرە بەرە لەبیری دەچیتەوە ..!!

سى يەم : دەست نویژ گرتن سرینەوەی گوناهەکان بەرزکردنەوەی پەلەکان بۆ بەهەشت :

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( ألا أدلكم على ما يمحو الله به الخطايا ويرفع به الدرجات ..؟! قالوا : بلى يا رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) .قال إسباغ الوضوء على المكاره وكثرة الخطا إلى المساجد وأنتظار الصلاة بعد الصلاة فذلكم الرباط فذلكم الرباط فذلكم الرباط )).رواه مسلم .

واته :ئایا شتیکتان پی بلیم : کە ( خوای گەورە ) گوناهەکانتان بسریتەوە و پەلەکانتان بەرز بکاتەوە ..؟! ووتیان بەلی . ئەی پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ئەویش فەرمووی : بە تەواوی دەست نویژ بگرن لە کاتی نارەحەتیش دابیت واتە : لەکاتی سەرما و گەرماو ناخۆشی دا ، پاشان هەنگاو نان بۆ مەزگەوت چاوری نویژ لە دوای نویژ بکەن ، ئا ئەوەی لە سەنگەری بەرگری دا بوون یان پابەند بوون بەفەرمانەکانی ( خوای گەورە ) ..؟!

چوارەم : ریك و پیکی ریزەکانی نویژی جماعە یان گەیاندنی ریزە کانی نویژی جماعە :

لە ( عائیشە )وە – خوا ای رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( إن الله تعالى وملائكته يصلون على الذين يصلون الصفوف ، ومن سد فرجة رفعه الله بها درجة )). رواه ابن ماجه ( ٩٩٥ ).

پینچەم : یادی ( خوای گەورە ) ذكر الله :

لە ( ابو هريره )وە – خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( يقول الله عز وجل : أنا عند ظن عبدي بي وانا معه حين يذكرني فإن ذكرني في نفسه ذكرته في نفسي ،وإن ذكرني في ملا ذكرته في ملا هم خير منهم ،وإن تقرب من شبرا ،تقربت إليه ذراعا ،وإن تقرب إلى ذرعا ،تقرب منه باعا ،وإن أتاني يمشي أيته هرولة )). رواه الترمذي برقم ١٨٨٦ .

واته : پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليەو سلم ) فەرمووی: ( خوای گەورە ) دەفەرمووی : لە فەرموودەیەکی قودسی دا : (( بەندەی من خۆی گومان پیچۆن بی ، من وادەبم لە گەلیدا ، گومانی باش بی بە من ، ئەوا میش باش دەبم بۆی ، ئەو گومانی خراپ بی بە من ، ئەوا منیش خراپ دە بم بۆی ، لەو دەمەدا کە ئەو ناوی من دەبا و یادو زیکیر من دەکات ، ئا منیش لەو دەمەدا خۆم لە گەلیدام ، جا ئەگەر ئەو بە تەنیا هەر خۆی یاد و زیکری من بکات ،ئەوا منیش هەر خۆم بە نهینی یادی ئەو دەکەم ، ئەگەر ئەو لە ناو کۆمەلیدا یاد و زیکری من بکات ،ئەوا منیش بە ئاشکرا لە ناو دەستەیەك دا لە ناو کۆمەلیك دا ، کە ئەوان باشترین ، یادی ئەو دەکەم ، ئە گەر بەندە بستی لە من نزیك ببیتەوە ، من بالی لەو نزیك دەبمەوە ،ئەگەر بەندە بالی لەمن نزیك بیتەوە ، ئەوا من دووبال لە و نزیك دەبمەوە ، ئەگەر ئەو بەرۆیشتنی ئاسایی بی بۆلای

من ، من به چركه‌یه‌ك یان لۆقه ده‌چم به‌ده‌میه‌وه ، واته: هه‌تا به‌نده‌ی من خۆی به تاعه‌ت و په‌رستن له من نزیك بكاته‌وه منیش ره‌حمه‌تی خۆم زیاتر له و نزی ده‌كه‌مه‌وه ..؟!!

**شه‌شه‌م : ئارام گرتن له‌سه‌ر به‌لاو نسیبه‌ت یان ( صبر على البلاء )**

( خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت : ﴿وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ﴾البقره ٤٥ . واته : ئێوه هه‌وڵبده‌ن پشت ببه‌ست به ئارام گرتن و نوێژ كردن بۆ گه‌یشتن به ئامانج ،به‌راستی نوێژ ئه‌ركیكی گه‌وره‌یه گرانه ،مه‌گه‌ر له‌سه‌ر ئه‌و كه‌سانه‌ی به خۆشه‌ویستی و سۆزه‌وه خوا په‌رستی ئه‌نجام ده‌ده‌ن و باوه‌ری دامه‌زراویان هه‌یه ..!!

هه‌روه‌ها پێغه‌مبه‌ری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ده‌فه‌رمووێت : (( عجبا لأمر المؤمن ،أن امره لكله خير ، وليس ذاك لأحد إلا للمؤمن : إن أصابته سراء شكر فكان خيرا له ، وإن اصابته ضراء صبر فكان خير له )).رواه مسلم . واته : كاروباری ئیماندار جێگای سه‌ر سورمانه ..!! هه‌موو كارێك فه‌رمانێك مایه‌ی خێره بۆی ، ئه‌مه‌ش بۆ هیچ كه‌سێك نیه جگه له ئیماندار نه‌بێت ،ئه‌گه‌ر تووشی خۆشگوزه‌رانی بێت سوپاسی خواده‌كات ده‌بێته مایه‌ی خێر بۆی ، ئه‌گه‌ر تووشی زیان بێت ئارام ده‌گرێت هه‌ر ده بێته مایه‌ی خێر بووی ..!

هه‌روه ها پێغه‌مبه‌ری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ده‌فه‌رمووێت : (( ما من يشاك شوكه فما فوقها إلا كتب له بها درجه ومحيت عنه بها خطيئة )). روامسلم برقم ٢٥٧٢ .

**حه‌ته‌م : دوا كردنی علم و زانستی شه‌رعی یان طلب علم :**

( خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رمووێت : ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾المجادلة ١١ .واتا: ئه‌وانه‌ی زانست زانیاریان پێدراوه چه‌نده‌ها پله پایه به‌رزیان ده‌كاته‌وه خواش ئاگای به كارو كرده‌وانه‌ی كه‌ئه نجامی ده‌ده‌ن ..!!

## هەشتەم : کەنچێك گەنچیەتی خۆی بەخت بکات یان تەرخان بکات  لە  پیناوی ئیسلام دا :

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( لاتنتفوا الشيب ، ما من مسلم يشيب شيبه  في الاسلام . قال عن سفيان ( إلا كانت له نورا يوم القيامة . وقال في حديث يخيى : ( الا كتب الله له بها حسنة ،وحط عنه بها خطيئة )) رواه ابو  داود برقم ٤٢٠٢ . واتە : مووی سپی سەرو ریش هەڵمەکیشن ، وە هیچ موسلمانیك نیە موو یەکی سپی کردبی لە ئیسلام دا ،سوفیان ووتی : ئیلا دەبیتە نووری رووناکی بۆی لە رۆژی قیامەتدا . وە لە فەرموودەکەی  یحیی فەرمووی : ئیلا ( خوای گەورە چاکەیەکی بۆ دەنووسیت و ، تاوان وگوناهو خرا پەیکی لەسەر رەشدەکاتەوە یان دەسریتەوە ..!!

## نۆیەم : زۆر تەواف کردن بەدەوری کەعبەی  پیرۆزدا :

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی : (( من طاف بهذا البيت أسبوعا  يحصه كتب لة بكل خطوة حسنة ، وكفر عنه سيئة ، ورفعت له درجة ، وكان عدل عتق رقبة )). رواه الترمذي برقم ٩٥٩ .

واتە: ئەوەی حەوت جار تەوافی ئەم مالە بکات ،ئەوا خیرو چاکەی بۆ دەنووسریت چاکەکانی زیاد کات هەنگاوبە هەنگاو بەرز دەبیتەوە  پلە بە پلە خیرو حسناتی چاکەی بۆ زیاد دەبیت ، وە دەبیت  کفالەتی گوناهەکانی بۆی دەسریتەوە ،  پلە کانی بەرز دەبنەوە ،وەك ئەوی کە بەندەیە ئازاد بکات یان رزگار بکات

## دەیەم : زۆر سووجدە بردن بۆ ( خوای گەورە ) :

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی : (( عليك بكثرة السجود ،لله ( عز وجل ) فانك لا تسجد الله  ( عز وجل )  سجدة إلا رفعك الله بها درجة ،وحط بها عنك خطيئة )). رواه مسلم ٤٨٨ كتاب الصلاة .

واتە: سوجدەی زۆر ببە ن بۆ ( خوای گەورە ) تۆ هەر  سوجدەیە دەبیت بۆ ( خوای گەورە ) ئەوا ( خوای گەورە )  پلە یەك بەرزت دەکاتەوە ، وە گوناهو تاوانیشت لە سەر کەم دەکاتەوە یان دەسریتەوە ..!!

### یانزەم : ڕووشت بەرزی ( حسن خلق ) :

پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( إن المؤمن ليدرك بحسن الخق درجة القائم الصائم )). رواه ابو داود ٤٧٩٨ . واتە : بەڕاستی ئەو کەسەی خاونی باوەرە ،بەهۆی خۆرەووشت و ئاکری جوانەوە پلە پایەی دەگاتە پلە پایەی ڕۆژووەوانی شەو نویژ کردن یان شەو نویژ کەر ..!!

### دووانزەم : ئەو کەسەی لە کاتی دەرچوونی بۆ بازار یان سفر نزادەکات :

پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرمووی : (( من دخل السوق فقال: لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو حي لا يموت بيده الخير وهو على كل شيء قدير كتب الله ألف ألف حسنة ومحا عنه ألف ألف سيئة ، ورفع له ألف ألف درجة وبني له بيتا في الجنة )).رواه الترمذي ٣٤٣٨ . واتە : ئە گەر کەسیك لە مال دەرچوو بۆ بازار یان سفر ئەم نزایە بکات ( : لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو حي لا يموت بيده الخير وهو على كل شيء قدير ) بلی : هیچ پەرستراویك نیە بە حەق جگە لە (الله ) بی هاوبەش ، مولك و ستایش بۆ ئەووە ،زیندو دەکاتەودەژینی دەمرینی (الله ) زیندوە هەرگیز نامری ،خیر وچاکە بەدەست ئەوە و بەسەر هەموو شتیکدا بە توانایە . ( خوای گەورە ) هەزار هەزار چاکەی بۆ دەنووسی ، وە هەزار هەزار خراپەی بۆ دەسریتەوە ، هەزار هەزار پلەی بەرز دەکاتەوە وە مالیکی بۆ ئامادە دەکریت لە بەهەشتدا ..!!

### سیانزەم : ئەوکەسەی نزا بۆ دایك وباوکی دەکات بۆ ئەوەی ( خوای گەورە ) لی یان خۆش بیت :

پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( أن الرجل لترفع درجته :فيقول : أنى لى هذا؟! باستغفار ولدل لك )). رواه ابن ماجه ٣٦٦٠. واتە : هەرکەسیك نزا بکات بۆ دایك و باوکی ئەوا پلەیەك بەرز دەبیتەوە بۆ بەهەشت ،ئەگەر بلی : لەدایك باکم خۆشبە ..!!

**چواردەم : خۆشەویستی ( خوای گەورە ) و پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ):**

( **خوای گەورە** ) **دەفەرموویت** : ﴿وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا﴾**النساء ٦٩** .

**واتا: ئەوەی فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەر بکات ، جا ئەوانە لەگەل ئەو کەسانەدا دەبن ( لە بەهەشتی بەریندا ) کە ( خوای گەورە ) نازو نیعمەتی رژاندووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و راستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاکان ، ئای کە ئەوانە هاوەل و هاوری و هاودەمیکی چاك و بی وینەن ..!!**

**لە ( ئەنسی کوری مالیك )وە – خوا لی رازی بیت – دەلی : جاء رجل إلى رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) فقال : يا رسول الله متى الساعة ..؟! قال : (( وما أعددت للساعة ..؟! )) قال : حب الله و رسوله . قال : (( فإنك من أحببت )). قال أنس : فما فرحنا بعد الإسلام فرحا أشد من قول النبي ( صلى الله عليه وسلم ) : (( فإنك مع من أحببت )) قال : أنس : فأنا أحب الله ورسوله وأبا بكر وعمر فأرجو أن أكون معهم وإن لم أعمل بأعمالهم )). رواه المسلم ٢٦٣٩ كتاب البر والصلة الآدب .**

**واتە : پیاویك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) قیامەت کەی بەرپادەبیت..؟! یان کەی دا دیت ..؟! پێغەمبە ری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فە رمووی : (( جیت بۆ ئامادە کردووە ..؟! )) پیاوەکە ووتی: خۆشە ویستی خوا و پێغەمبەرەکەی ..!! پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فە رمووی: (( بە راستی تۆ لەگەل ئە وکەسە دایت کە خۆشت ئەویت )) ئە نس دە لی : لە دوای موسلمان بوون ، هیچ ئەوەندە خۆشحالی نەکردین ..!! ئەوەندەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ((بەراستی تۆ لە گەل ئەو کەسە دایت کە خۆشت دەویت )) ئەنس دەلی : بەرستی من خوا پێغەمبەرەکەی وە ابو بکر و عمر م خۆش دەویت ، ئومیدم وایە لە گەل ئەوان دابم باکردەوە کانیشم وەك ئەوان نەبیت ..!!**

**پانزه م : نیەت الاخلاص یان دلسۆزی هەبێت بەرانبەر ( خوای گەورە ) بۆ تۆبە کردن :**

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّاكِرِينَ﴾هود ١١٤

. واتا : بەڕاستی کردەوەی چاکە کان کردارە خڕپە کان لادەبان یان دەیان سڕیتەوە یان گوناهەکان دەشواتەوە ،ئەوە ئامۆژگاری بیرکردنەوەیە بۆ ئەوانەی یادی خوای گەورە دەکەن ..!!

پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( إن الله تعالى لا يقبل من العمل إلا ما كان له خالصا وابتغى به وجهه )) رواه النسائي ٣١٤٠ . واتە : ( خوای گەورە ) هیچ کردەوەیەك ورناگری مەگەر بە دلسۆزی تەنها بۆ خوا بێت و لە پێناوی ئەو دابێت ..!!

**شانزەم : ( تۆبە ) کردن و نەگەڕانەوەی بۆ سەر گوناهەکان لە دوینا و دوا ڕۆژدا سەرفراز دەبێت :**

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا﴾الفرقان ٧٠ .

واتا : جا ئەوەی کە تۆبە دەکات و کارو کردەوەی چاکە ئەنجام دەدات و بە تەمایە پەروەردگار تەوبەکەی لیوەر بگریت ، ئەوە بێگومان دەگەڕیتەوە بۆ لای خوا بە تەوبەیەکی ڕاست دروستەوە ..!!

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَأَنِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُمْ مَتَاعًا حَسَنًا إِلَىٰ أَجَلٍ مُسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٍ فَضْلَهُ وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ﴾ هود ٣ . هەروەها ( خەلکینە ) دوای لیخۆشبوون لە پەروەدگارتان بکەن ، لەوەودوا بگەرینەوە بۆ لای ، ئەو کاتە بە چاکە دەتان ژینیت ، وە بەژیانیکی چاك ، تا کاتیکی دیار کراو ، هەروەها پاداشتی هەموو خاوەن چاکەیەك بەزیادەوە دەداتەوە ، خۆ ئەگەر ( ئیوە ) پشت هەلکەن و گویرایەلی فەرمانی خوا نەبن ، ئەوە بەڕاستی من دەترسم کەسزای ڕۆژیکی گەورە و سەخت یەخەتان پی بگریت کە ڕۆژی قیامەتە ، یان ئەو ڕۆژەی ( خوای گەورە ) لە ناوتان دەبات ..!!

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا (١٠) يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا (١١) وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَلْ لَكُمْ أَنْهَارًا﴾نوح ١٠-١٢ . واتا: بەردەوان پیم دە ووتن : ئیوە دوای لیخۆشبوون لە پەروەدگارتان بکەن چونکە بەراستی ئەوزاتیکی لیخۆشبووە ..!!بارانتان بەلیزمە نرمە بۆ دەباریت ..!!مال سامان و نەوەتان پی دەبەخشیت ،هاوری لەگەل باخ و باخاتدا ،رووبارو چەم جۆگەتان بۆ بەدی دەهینیت ..!!

( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَأَمَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَعَسَى أَنْ يَكُونَ مِنَ الْمُفْلِحِينَ﴾القصص ٦٧. واتا: جا ئەوەی (تۆبە ) ی کردووە باوەری دامەزاروی هیناوە و کارو کردەوەی چاکی ئە نجام داوە ، ئەوە بیگومان ئەو جۆرە کەسانە لە سەرفرازو بەختەوەران دەبن ..!!

( خوای گەورە ) ﴿إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَأُولَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْئًا﴾مریم ٦٠ . واتا: جگە لەوانەی کە (تۆبە ) دەکەن و باوەری دامەزراو دەهینن و کارو کردەوەی چاك ئە نجام دەدەن ،ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و هیچ جۆرە ستەمیکیان لی ناکریت ..!!

هەروەها (ابن قیم ) (رحمه الله ) لە کتابی ((الداء والدواء )) گوناهو تاوان و خراپە کاری زیانەکانی زۆرن ئەگەر ئەو کەسە لەسەری بەدەوام بیت (تۆبە ) لە سەر نەکات ئەمانە :زیانەکانی گوناهو تاوان وخراپەکاریە : ١-بی بەش بوون لە زانستی شەرعی. ٢-بی بەش بوون طاعة و عیبادة وخوا پەرستی .

٣-ئابوورو شەرم و حیایی نامینی .٤-سینەی پیسە ناپاکە . ٥-دوا رۆژی خراپە واتا بەشیوەیەکی زۆر خراپە و ناخۆش کۆتای بە ژیان دەهینی .٦- دلی مۆری رەشی لیدراوە .٧-هیچ موفق نابیت یان سەرکەوتوو نابیت لە دونیا لە دوارۆژ دا .٨-دلیکی درندەیی هەیە . ٩- ژیر کەوتوو دەبیت یان لە گوناهو تاوان نقووم دەبیت . ١٠- دوور دەکەویتەوە لە نیعمەت و برکەتی (خوای گەورە ).١١-شوینی لە جیگای تاوانبارانە ١٢-سزا دەدریت لە دوا رۆژدا یان لەرۆژی قیامەت بەشیوەیەکی زۆر بەئیش و ژان سزا دەدریت..!؟

حەفدەم : ڕۆژوو گرتنی ڕۆژی ( عرفه ) :

له (ابی قتاده )وه – خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( صيام يوم عرفة ، إني على الله أن يكفر السنة التي قبله والسنة التي بعده )). رواه الترمذي ٧٤٩ .

واته : ئومید دەکەم له ( خوای گەوره ) كه ڕۆژووی ( عەرفه ) ببیته کەفارەتی گوناهی سالی پیشوو و سالی داهاتووه ..!!

هەژدەم : ڕۆژووگرتن له پیاوی خودا :

له (ابی سعید خدری ) – خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( ما من عبد يصوم يوما فی سبيل الله ، إلا باعد الله بذلك اليوم وجهه عن النار سبعين خريفا )).رواه البخاري كتاب الجهاد برقم ٢٦٨٥ . واته : هەر بەندەیەك ڕۆژیك له پیناوی خوا دا بەڕۆژوو بیت ئەوا ( خوای گەوره ) بە و هۆیە (٧٠) پاییز ڕوخساری له ئاگری دۆزەخەوه بە دوور دە گریت ..!!

نۆزدەم : کردنی دوو نویژی فینك:

له (ابی بكر ی كوری ابو موسى الاشعرى له باو كیەوه )- خوا لیان رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( من صلى البردين دخل الجنة )) رواه البخاري برقم ٥٤٨ .

واته :هەر کەسیك دوو نویژه فینکەکه بکات واته : (نویژی بەیانی و نویژی عەسر ) ئەوا دەچیت بەهەشتەوه ..!!

بیستەم : شەو نویژ کردن و دوعاو نزا کردن :

پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی : (( عليكم بيقام الليل ،فإنه داب الصاليحن قبلكم ، وهو قربة لكم إلى ربكم ومكفرة للسئات ، ومنهاة عن الإثم )).رواه الحاكم في المستدرك ٣٠٨/١ .

واته : پیتان رادەگەیانم بە شەو نویژ کردن و دعا و نزاو پارانەوه له نیوه شەو دا ،چۆنکه ئە کرداره و ئاداب و خۆرەوشتی پیاوچاکانە له پیش ئیوەدا ، هەروەها له ( خوای گەوره ) نزیك دەبنەوه ، وه دەبیته کەفالەتی گوناهەکان تان ، هەروەها سرینەوەی تاوانەکان ..!!

**بیست یەك : ( الصدقه ) یان خیر صدقه و بەخشین و چاكه كردن :**

( **خوای گەوره** ) **دەفەرموویت** :﴿ إِنْ تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِنْ تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَيُكَفِّرُ عَنْكُمْ مِنْ سَيِّئَاتِكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾**البقره ٢٧١** .

**واته: ئەگەر خیر چاكه و بەخشینەكانتان به ئاشكرا ئه نجام بدەن ئەوه شتیكی چاكه ،خۆ ئەگەر بیشارنەوه ،بیدەن به هەژاران به نهینی ئەوه چاكتره بۆتان ، جا به و بەخشینه خوا هەندیك له گوناهەكانتان دەسریتەوه و خوا ئاگای بەو كارو كردەوانەیكه ئه نجامی ده دەن ..!!**

**پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت:** (( الصدقة تطفئ الخطيئة كما يطفئ الماء النار )) **رواه الترمذي** ٢٦١٦ . **واته: خیر صدقه بەخشین له پیناوی خوادا ، گوناهو تـاوان دەكوژینیتەوه وەكو چۆن ئاو ئاگر ده كوژینیتەوه ..!!**

**بیست دوو :ئەو كەسەی تـاوانی یان گوناهی لی دەردەكریت به پی شەرعی خوا و پیغەمبەرەكەی ( صلی الله علیه وسلم ) ( إقامه الحدود :**

**پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفه روویت :** (( أيما عبد أصاب شيئا مما نهى الله عنه ،ثم أقيم عليه حده ، كفر عنه ذلك الذنب )). **اخرجه الحاكم ٤/٤٢٩** .

**بیست سي : گویرایەلی فەرمانەكانی خواو پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) إطاعة الله والرسول :**

( **خوای گەوره** ) **دەفەرموویت** : ﴿وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَنْ يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا﴾**الفتح ١٧** .

**واتا : ئەوەی فەرمانبەردای یان گویرایەلی خوا پیغەمبەره كەی بكات ، دەخریته باخەكانی بەهەشتەوه كه چەندەها رووبار بەژیر درەخت و كۆشكه كانیادا دەروات ،ئەوكەسە ش كه پشت هەلكات ( خوای گەوره ) سزای بەئیش وئـازاری دەدات ..!!**

**هەروەك پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرمووی :** (( كل أمتي يدخلون الجنة إلا من أبي )). قيل : ومن يأبي يا رسول الله ؟! قال : (( من أطاعني دخل الجنة ومن عصاني فقد أبي )). **رواه البخاري ٧٢٨٠** .

**بیست چوار: ترسان لە ( خوای گەورە ) الخوف من ( الله ) :**

( **خوای گەورە** ) **دەفەرموویت :** ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ﴾ **الرحمن ٤٦ .**

**واتا: بۆ ئەو کەسەش کە لە مقامی پەروەدگاری خۆی ترسابیت ،دوو باخی رازاوەی بە هەشت ئامادەیە بۆی ..!! ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :** ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى (٤٠) فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ **النازعات ٤٠-٤١ . واتا:بەلام ئەوەی لە پایەو شکۆی پەروەدگاری تر سابیت و حیسابی بۆ کردبیت و جلەوی نەفسی خۆی گرتبیتەوە لەهەموو هەواو هەوەس ئارەزوویەکی نادروستی دونیا ..!! بی گومان هەر بەهەشت جیگەی مانەوە و حەوانەوە و ژیان و گوزەرانیەتی ..!!**

**لە ( ابی هریرە ) وە –خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) فەرمووی : (( من خاف أدلج ومن أدلج بلغ المنزل ألا إن سلعة الله غالية ألا سلعة الله الجنة )) رواه الترمذي ٢٤٥٠ .**

**واتە :هەر کەس برترسیت لە سەرەتایی شەوەوە زوو بەری دەکەویت ، هەر کەس زوو بەری بکەویت ، دەگاتە مەنزل و واتە ئەو جیگایەی کە خۆی دەیەویت ، هۆشیار بن بی گومان بەهەشتی ( خوای گەورە ) گران بەهایە بۆ ئەو کەسەی کە دەیەویت ..!!**

**بیست و پینج: شەهید بوون لە پیناوی ( خوای گەورە ) دا الشهادە فی سبیل اللە :**

**پیغەمبەری خوا ( صلی اللە علیە وسلم ) دەفەرموویت : (( اللشهيد عند الله سبع خصال : يغفر لة في اول دفعه من دمه ويرى معقده من الجنة ويحلى حلة الإيمان ويزوج أثنين وسبعين زوجة من الحور العين ويجار من عذاب القبر ويأمن من الفزع الأكبر ويوضع على راسه تاج الوقار الياقوتة منه خير من الدنيا وما فيها ويشفع في سبعين إنسانا من أهله )) رواه الترمذي ١٦٦٣ .**

**واتە : شەهید لە لای ( خوای گەورە ) شەش بەهرەی هەیە : لە گەل یەکەم دلۆپە خوینی کەلی دەرژیت ئەوا ( خوای گەورە ) لی خۆش دەبیت و شوینی خۆی لە بەهەشتدا نیشان دەدری ، لەسزای ناو گۆر رزگاری دەبی ، لە ترس و لەرزی گەورەی رۆژی قیامەت پاریزراوە دەبی ، تاجی ویقاری ریز دەخریتە سەری ، دەنکە یاقونی ئەو تاجە چاکتر لە هەموو دونیا و ئەوەی کە تیدایە ،هەروەها ( ٧٢ ) پەری یان حوری العین بەهەشتی لی مارە دەکریت ، هەروەها شەفاعەت بۆ ( ٧٠ ) کەس لە کەس وکاری وەردەگریت ..!!؟**

پیغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( إن أرواح الشهداء في طير خضر تعلق من ثمر الجنة أو شجر الجنة )). رواه الترمذي ١٦٤١ .

واتە : رووحی شەهید دەكریتە بەری پەلەووەری سەوز ، لەبەری دارو درەخت و میوە و بەروبومەكانی بەهەشت دەخۆن ..!!

بیست شەش : دەست گرت بە قورئانی پیرۆز (التمسك بالقران ):

لە (ابو هريره )وە – خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : (( ما من الأنبياء نبي الا اعطى ما مثله امن عليه البشر وا نما كان الذي اوتيته وحيا او حاه الله الى فارجو ان اكون اكثرهم تابعا يوم القيامة )) . رواه البخاري برقم ١٧٢٢ .

واتە: هەموو پیغەمبەری لە كاتی خۆیدا ،نیشانەی گەورە و موعجیزەیەكی وەهای پیدراوە ، كە ئادەمیزادەكانی سەردەمی خۆی بە هۆی ئەو نیشانە و موعجیزانەوە یئمان و باوەریان پی هیناوە ،بەلام ئەو موعجیزەیەی كە خەلات كراوە بە من ئەم قورئانیە ، ك خودا بە وەحی وسروش بۆی ناردووم ،كە لایەنی ئیعجازەكەی نەبراوەیە و هەمیشە بەردەوامە بۆیە ئومید دەكەم لەرۆژی قیامەت دا من لە هەموو پیغەمبەرەكانی تر ئۆمەتم زۆر تر بیت ..!!

هەروەك پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( من قرأ حرفا من كتاب الله فله بكل حرف عشر حسنات )) اخرجه البزاز في مسنده .

واتە: هەركەسیك پیتیك لە پیتەكانی كتابی خوا واتە: (قورئان ) بخوینیت ،بۆ هەر پیتیك (١٠) خیری بۆ دە نووسریت ..!؟

لە(عامری كوری واثلة ) دە گیریتەوە دەلی : (( إن نافعمبن عبدالحارث ) لقي عمر بسعفان وكان عمر يستعمله على مكة فقال : من استعملت على أهل الوادي فقال: ابن أبزى ، قال: ومن ابن ابرى قال : مولى من موالينا ، قال : فستخلفت عليهم مولى قال : عمر أما إن نبيكم (صلى الله عليه وسلم ) قد قال : إن الله يرفع بهذا الكتاب أقواما ويضع به آخرين )) رواه مسلم .

واتە: (عامري كوري واثلة ) دەلی : كە عمر كردبووی بە كار بەدەستی خۆی (نافع عبدالحارث ) لە عەسفات ، گەیشت بە عمر ووتی : كیت كردووە بە كار بەدەست لەسەر خەلكی ئەم دۆلە ..!؟ ئەویش ووتی : (ابن لابزی ) ووتی : (ابن لابزی ) كیە ..!؟ ووتی : یەكیكە لە كار گوزارەكانمان یان بەردەستەكانمان یان خدامەكانمان یان (مولی ) ..!! ئەویش ووتی : جا چۆن دەبیت خزمەتگارت یان بەردەستی خۆت كردوە بە جینشینی خۆت لەسەر یان ..!!ئەوویش ووتی : ئەوە كەسیكی قورئان خوینە

وشارەزای زانستی میرات بەش کردنە (علم الفرائض) عمر –خوا لی رازی بیت – ووتی راستە پیغەمبەرە کەتان (صلی اللە علیه وسلم) فەرمووی : لە راستیدا خوا بە هۆی ئەم قورئانەوە چەند گەل و هۆزێك سەربەرز دەكات و چەندانی تریش نزم و سەر شۆر دەكات ..!!

لە (عقبە كوری عامر) – خوا لی رازی بیت – دەلی : ((خرج رسول اللە (صلی اللە علیه وسلم) ونحن فی الصفه فقال : ((أیكم یحب أن یغدو كل یوم إلی بطحان او إلی العقیعق فیاتي منه بناقتین كوماوین، في غیر إثم ولا قطع رحم)) فقلنا : یا رسول اللە (صلی اللە علیه وسلم) نحب ذلك . قال : ((أفلا یغدو أحدكم المسجد فیعلم او یقرا أیتین من كتاب اللە عز وجل، خیر له من نا قتین و ثلاث (خیر من ثلاث) وأربع خیر من أربع ومن أعددهن من لإبل)). رواه مسلم .

واتە :لە كاتیدا ئیمە لە بن هەیوانی مەزگەوتە كە دابوویت (الصفه) پیغەمبەر (صلی اللە علیه وسلم) تشریفی هات و فەرمووی : كام لە ئیوە هەمووڕۆژك بچیت بۆ (بتحان) یا (عقیق) و دوو ووشتری سەركۆپارەی قەلەوەی پیبیت بی ئەوەی گوناهبار ببیت ، یا دلی هیچ هزمیكی لی بئیشیت ،ووتمان : هەموومان حەز بەوە دەكەیت فەرمووی : ئەی ناركیت هەریەكی لە ئیوە سەر لەبەیانی بروات بۆ مەزگەوت دوو ئایەت لە قورئان فیرببیت یان بخوینیت كەباشترە لەدوو ووشتری ، سیانیش باشتر بۆی لە سیان و چواریش باشتر بۆی لە چزارە و بە پیی ژمارەیە ئایەتەكان لە ووشتر ..!!

هەروەها لە (ابی موسی الاشعری) – خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغەمبەری خوا (صلی اللە علیه وسلم) فەرمووی : ((مثل المؤمن الذي یقرا القرآن مثل لاترجة ریحها طیب وطعمها طیب ،ومثل المؤمن الذي لا یقرا القرآن مثل التمر ،لاریح لها وطعمها حلو ، ومثل المنافق الذي یقرا القران مثل الریحانة ،ریحها طیب وطعمها مر ، ومثل المنافق الذي لایقرا القران أن كمثل الحنظلة ،لیس لها ریح وطعمها مر)) البخاري كتاب فضائل القران ٤٧٣٢. واتە : نموونەی ئیمانداری قورئان خوین وەك : نموونەی : بەهییە ، واتە: بۆنی خۆشە وتامیشی خۆشە ..!!، ئیمانداری قورئان نەخوینیش وەك: نموونەی : خورما وایە واتە : بۆنی نیە تامیشی خۆشە و شرینە ..!!،وە وو رووی یان منافق ی قورئان خوین وەك :نموونەی : ریحان وایە : واتە : بۆنی خۆشە بەلام تامی ناخۆش تالە ..!! دوو رووی قورئان نەخوینیش وەك : نمونەی : كوژالك وایە واتە : نە بۆنی خۆشە نە تامی خۆشە تالە ..!!

**بیست حەوت : راست گۆیی ( الصدق )**

پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( علیكم بالصدق یهدی إلی البر وإن البر یهدی إلی الجنه وما یزال الرجل یصدق ویتحری الصدق حتی یكتب عندالله صدیقا .. )). راوه مسلم ٢٦٧٠ .

واته : ئامۆژگاریتان دە كە بۆ راستگۆیی ، چونگه راست گۆیی هیدایه تەبۆ چاكه كردن وه چاكه كردنیش هیدایەتە بۆ چوونه بەهەشت ، هەر وەك ئەو پیاویه كه راست گۆیە له كردە وه كانی دا هەتا له لای خوای گەوره بۆی دەنووسریت راست گۆ..!!

**بیست هەشت : كفالەتی هیتیم یان كفالەتی الیتیم :**

له ( ابی هریره )وه – خوا لی رازی بیت – دەلی : پیغه مبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت :

(( الساعی علی الارملة والمسكین كالمجاهد في سبیل الله )) رواه الخاري ١٧٦٧.

واته : كەسكیك جیهاد تی كۆشان بكات له پیناوی ژنی بیوه ژن یان بی پیاو یان كەسی هەژار له پیناوی خودا دا كفاله تیان بكات بەخیویان بكات وه خزمەتیان بكات وه مسەرف و نفق و پیداویستی ژیان ،ئەوه بەقەد ئەو جیهادەیه كەله پینای خوا خۆی بەخت دەكات ، خیرو پاداشتی مجاهید وەردەگریت ..!!

وه له ریوایەتیكی تری مسلم دا هاتوو دەفەرمووی : (( أنا وكافل الیتیم له او غیره فی الجنه )) راواه مسلم ٢٦٠٧ . كتاب البر والصله .واته : هەر كەسیك كفاله یان خزمەتی یان مسروف نەفقەی هیتم بكات او جگە لەو وەك هەژاران بی سەرپەرشتان ، ئەو ا دەچیته بەهەشتەوه ..

**بیست نۆ: پیچ چاكه یان كردەوه له رۆژیك دا ئه نجام بەدەی دەچیته بەهەشتەوه :**

پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( خمس من عملهن فی یوم كتبه الله من أهل الجنه : من صام یوم الجمعه ، )) . (( راح إلی الجمة وعاد مریضا وشهد جنازة وأعتق رقبة ))

واته : له رۆژی هەینی دا بەرۆژوو ببی ، وه بچیته ووتاری هەینی ،سەردانی نەخۆش بكەیت ،وه بەندەیەك رزگار بكەیت دەچیته به هەشتەوه ..!!

**سیی یەم : دروست کردنی مەزگەوت :**

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( من بنى مسجد الله له بيتا فى الجنه )) رواه مسلم

واتە : هەر کەسیك لە دونیادا مەزگەتیك لە پیناوی خوا بنیان بنی یان دروست بکات ئەوا ( خوای گەورە ۹ لە بە هەشتدا مالی یان کۆشکیکی بو دروست دەکات ..!!

**سیی و یەك : ووتنی ( لا حول ولا قوة إلا بالله ) گنچینەیەکە لە گەنچینەکانی بەهەشت :**

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی : هەر کەسیك ئەم نزایە بکات بەلی : (( لا حول ولا قوة إلا بالله )) ئەوان دەبیتە (( كنز من الكنوز الجنه )) متفق عليه .

**سیی و دوو : گران کردنی چاکەکانت لە سەر میزانی رۆژی قیامەت :**

پیغە مبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی : (( كلمتان حبيبتان إلى الرحمن ، خفيفتان عى اللسان ،وثقيلتان في الميزان ، سبحان الله وبحمدة ،سبحان الله العظيم )).رواه البخاري .

**سیی و چوار : ئە تەویت ( خوای گەورە ) لە گوناهو تاوانەکانت خۆش بیت ..؟!**

پیغەمبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( من قال سبحان الله وبحمده فى يوم مائة مرة حطت خطاياه وان كانت مثل زبد البحر )) متفق عليه . واتە : هەر کەسیك بلی : سبحان الله وبحمده لە رۆژیکدا ( ۱۰۰ ) جار ئەو ( خوای گەورە ) لە گوناهەکانی خۆش دەبیت ئەگەر بەقەد کەفی دەریاش بیت ..!!

**سیی و پینج : دوای مردنیشت خیرو چاکەت بۆ دەنووسریت ..؟!**

پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( إذا مات ابن آدم إنقطع عمله إلا من ثلاث : صدقة جارية ، أو علم ينتفع به ، أو ولد صالح يدعو له )) . واتە : هەر کەسیك بمریت یان وەفات بکات ئەوا کردەوە کانی دەوەستیت و زیاد ناکات ، تەنها لە ( ۳ ) کردەوە وچاکە دانەبیت ئەویش خیرو چاکەی بەردەوام دەبیت وەك : صدقەجاری وەك دروست کردنی مەزگەوت یان پرد و یان شتیکی وەك خیری بەردەوام کە دوای مردنی خاوەنەکەی خەلکی سوودی لی وەرگرن ،یان زانستیکی شەرعی یان زانستیك سوودی بۆ خەلك هەبی ، وە یان منداليكی صالح و چاکەکاری لە دوای خۆی بەجی بی لیت ..!!

سیی و شەش : هەرکەسیك لە رۆژیكدا دە جار ( قل هو الله احد ) بخوینیت:

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( من قرا : ( قل هو الله احد ) عشر مرة بني الله له بيتا في الجنة )) رواه احمد . واتە : هەر کەسیك ( ١٠ ) جار لە رۆژیكدا ( قل هو الله احد ) بخوینیت ئەوا کۆشكیکی بۆ دروست دە کریت لە بەهەشتدا ..!!

سیی وحەوت : هەرکەسیك ( ١٠ ) لە سورەتی کهف لەبەر بکات لە فتنەی دجال بەدوور دەبیت ..؟!

پیغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( من حفظ عشر أيات من أول سورة الكهف عصم من فتنة الدجال )) رواه مسلم .واتە : هەرکەسیك ( ١٠ ) ئـایەتی سەرەتـای سورەتی کهف لەبەر بکات ئەوا لەفتنە ی دجال بەدوور دەبیت یان دە پاریز ریت ..!!

سیی وهەشت : ئە تەویت لە ژیر پاراستن زمانی ( خوای گەورە ) دا بیت ..؟!

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی : (( من صل الفجر فهو في ذمة الله وحسابه على الله )) رواه التبراني و صححه الالباني . واتە : هەر کەسیك نویژی بەیانی ئە نجام بدات ئەوە لە زەمانەت و پاراستنی ( خوای گەورە ) دایە ولێپرسینەوەشی لەسەر ( خوای گەورە ) یە ..!!

سیی و نۆ : پیت خۆشە رزق و تەمەنت دریژ بیت ..؟!

پیغەمبەری خوا ( صل الله عليه وسلم ) دەفەرموویت : (( من أحب أن يبسط له رزقه وأن يسأله في أثر فليصل رحمه )). متفق عليه . واتە : هەر کەسیك پیی خۆش بیت رزق و رۆزی زۆر بیت و تەمەنی دریژ بیت ئەوا با صیلە رەحم ئە نجام بدات ..!!

چل : هەرکەسیك ریگەی زانست زانیاری شەرعی بگریت ..؟!

پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرمووی : (( ومن سلك طريقا يلتمس فيه علما سهل الله له طريقا إلى الجنة )).متفق عليه . واتە : هەر کەسیك ریگەیەك بگریت کە زانست و زانیاری تیدا دەست بکەویت ( خوای گەورە ) بەهۆیەوە ریگای چوونەبەهەشتی بۆ ئـاسان دەکات ..؟!

چل و یەك : هەر كەسێك لەنوێژ واجبە كان ئایەتی الكرسی بخوێنی ڕێگای لی ناگری لەبەهەشت..؟!

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرمووێت : (( من قرأ أيات الكرسی دب كل الصلاه مكتوبه لم يمنعه من دخول الجنه إلا ان يموت )) .اخرجه النسائى فى الكبرى ٦/٣٠ .

چل و دوو : هەر كەسێك سوورەتی تبارك بخوێنی هەمووشەویك دەچیتە بەهەشتەوە ..؟!

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرمووێت : (( سورة من القرآن ما هي إلا ثلاثون آية خاصمت عن صاحبها حتى أدخلتة الجنة وهي تبارك )). رواه الطبراني في الاوسط .

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرمووێت : (( سورة تبارك هي المانعة من عذاب القبر )).الصحيح الالباني (١١٤٠ )

چل وسی : ئەو كەسەی گەورەیی لیخۆش بوون بخوێنی شەو ڕۆژ (سيد الاستغفار ) ) دەچیتەبەهەشت ..؟!

پێغەمبەری خوا (( سيد الاستغفار أن تقول : اللهم أنت ربي لا إله إلا انت خلقتني وأنا عبدك ،.وأنا على عهدك ووعدك ما استطعت ،أعوذبك من شر ماصنعت ، .أبوء لك بنعمتك على ، وأبوء لك بذنبي ،فاغفر لي ، فإنه لا يغفر الذنوب إلا انت : من قالها من النهار موقنا بها فمات من يومه قبل أن يمسى فهو من أهل الجنة ومن قالها من الليل وهو موقن بها ،فمات قبل أن يصبح فهو من أهل الجنة )).رواه البخاري ٦٣٠٦

واتە : ئەی خوایە !! هەر تۆ پەروەدگاری منیت . لە تۆ زیاتر هیچ خوای کی تر نیە ..!! من بەندەی تۆم یان عبدی تۆم ..!! وە تۆ منت لە نەبوونەوە دروست كردووە ،تا بتوانم پەیمان و بەلینی تۆ ناشكینم ..!! كە نەشم توانی ئەو لە دەسا وەسان نیمە ..!! چونك ستەمە بەندە بتوانی تەواوی ئەركی سەر شانی خۆی بە جی بەهینی ..!! پەنا دەگرم بە تۆ لەشەری كردەوەی خۆم ..!! كەدەبی بەمایەی تۆلە بۆم ..!! تۆ سەرچاوەی نازو نیعمەتی بۆ من ..!! وە هەمیشە چاكەو نیعمەتی بس ژماری تۆم لە بەر چاوە ..!! پی دەنیم لە گوناهباری خۆم ..!! كەواتە : لیم خۆش بە ، بەراستی تۆ نەبی كەسی تر ناتوانی و هیچ كەس رادەی ئەوەی ناكەوی ك لە گوناهی بەندەی خودا خۆش بی ..!! بەلی هەركەسێك ئەو نزایەی خوێند لە ڕۆژێك دا دوای ئەوە بمریت ئەوا (خوای گەورە ) دەی باتە بەهەشتەوە ، بەهەمان شیوە ئەگەر هاتوو لە شەودا ئەم نزایەی خوێند و دوای ئەو مرد یان وەفاتی كرد ،ئەوا (خوای گەورە ) دەی باتەهەشتەوە ..؟!

**چل چوار : هەرکەسیك داد پەروەر بیت ئەوا دەچیتە بەهەشتەوە :**

**پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( القضاء ثلاثة أثنان في النار و واحد في الجنة ..رجل علم الحق فقضى بة فهو في الجنة ... )). صحيح ابو داو برقم ٣٥٧٣ .**

**واتە : داد پەروەران یان قاضي سیانن : یەکیکیان لە بەهەشتدایە ، دووانەکەی تر لە نا ئاگری دۆزەخ دان ،ئەوە یان کەلەبەهەشتدایە ئەوەیە کە زانیویەتی یان علم هەبووە یان اجتهادی کردووە لە پیشەکەی خۆی ، کامە حەق و بەشیوەیەك حوکمی کردووە یان دا پەروەری کردووە ئەوا دەچیتە بەهەشتەوە .. ئەووشی کەزانیەتی کامە حەق و زولم ستەمی تیدا کردووە بە شیوەیە کی داد پەروەرانە حوکمی نەکردووە ئەوا لە ئاگری دۆزەخ دایە ، بە هەمان شیوە ئەوەی ئەو قازیە ی تری ئان ئەو دادوەرەی تریش کە بەنەزانی حکمی ین دادوەری کردووە لە نیوان خەلکیدا نەزان بووە لە پیشەکەی خۆی ئەوا دەچیتە ناو ئاگری دۆزەخ ..؟!**

**چل و پینج : هەرکەسیك لە سەر مال و سامانی خۆی بکوژریت ستەمی لیکراوە، دەچیتە بەهەشتەوە :**

**پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : ((من قتل دون ماله مظلوما فله الجنة )).اخرجة النسائي في الكبرى ٢/٣٠٩ .**

**واتە : هەرکەسیك لە سەر مالی خۆی بەرگری بکات و بە ستەم لی کردن بکوژریت ئەوا دەچیتە بەهەشتەوە .**

**چل و شەش : هەژاری یان فەقیری ئارام گر لە نارەحەتیەکانی ژیانی دونیا :**

**پیغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموویت : (( قمت على باب الجنة فإذا عامة من دخلها المساكين )) . متفق علیه . واتە : ئەو فەقیرە یان ئەو هەژارەی کەصبر ئارامی گرتووە لەژیانی دونیادا ، ئەوا ( خوای گەورە ) دەیخاتەبەهشتەوە ، بەلام فەقیر موسلمان و ئیماندار لەخوا ترس ..؟!**

له کۆتایی ئەم پەرتووکە پێشکەشە موسلمانانی جیهان بەگشتی بەتایبەتی موسلمانانی وەلاتەکەم

نزا دەکەم لە ( خوای گەورە ) لە سەر ئەم ئاینە بمان مرینی ، وە دلسۆزمان بکات بە نیەتی چاك ، بەلی بەریزان ئەوانەی کە لەم پەرتووکەدا یان لە م کتابەدا باسم کردووە تەنها بۆ رەزامەندی ( خوای گەورە ) یە کەبۆ بەندەکانی خۆی ،چونکە دۆزەخ بەهەشت شوینی سزاو پاداشتە ئەم کتابە دوو بەشە بەشی یەکەم باسی مالی جحیم بەشی دووەم مالی نعیم ،واتە : دۆزەخ بەهەشت ، بەلی بۆ هەموو مرۆڤیك پویستە بزانیت بۆ چی دروست کراوە ..؟وەبۆچی دەژیت ..؟! بۆ کوی دەگەریتەوە ..؟! وە پەرستن بۆ کی دەکات ..؟!

دیارە لەم کتابەدا باسی ئەومان کردووە بۆ کوی دەگەرینەوە ، یان ئەوەتا مالیك مان دەبیت لە مالی جحیم یان ئەواتا مالیك مان دەبیت لە مالی نعیم ،جا بۆئەوەی نەچیت بۆ مالی جحیم دەبیت دوور بکەیتەوە لە هەموو کردەوە خراپەکان ، بۆ ئەوەی بچیت بۆ مالی نعیم دەبیت ( خوای گەورە ) لیت رازی بیت کردەوەی چاکە ئە نجام بدەیت ، بەلی لە خوای گەورە نزا دەکەین کە بەمالی نعیم شادمان بکات ، یان بەهشتی بان وبەرین شادمان بکات ، لە ئاگری دۆزەخ دوورمان بکات ، هیوادارم ئەوەی ئەم پەرتووکە دەخوینیتەوە پاداشتی بەقەد من بی کە هەولی زۆرم داوە شەو نخونیم تیدا کردووە ، بۆئەوەی ئەم پەرتووکە ئاشنابکەم بەخوینەرانی موسلمانان ، بۆئەوەی مالیك دورست بکەن لە مالی نعیم یان لە بە هەشتدا ، کە مالی دونیا تەنها ماوەیەکی کەم و بەسەر دەچیت ، تەنها ئەوەی دەمینیتەوە کردەوەکانمانە بۆ مالی نعیم یان بۆ بەهەشت ، جا ئەوەی تۆزیك بیربکاتەوە یان بەراوردیك بکات ، لە نیوان مالیکی هەمیشەیی یان مالیکی کاتی زۆر کەم تیدا دەژی ، ئەوا کەمیك هۆش و عەقلی هەبیت ، دەبیت خۆی ئامادە بکات بۆ مالە هەمیشەیەکە ،جا نزا دەکە ( خوای گەورە ) لە گوناهو تاوانەکانمان خۆشبیت ،وە هەرچی کەم کوری هە یان هەلەیەکمان کردووە بە گەورەی زاتی خۆی لیمان خۆشبیت ، چونکە هەر ئەو ( خوایە ) زانا و دانایە

وە مافی بلاو کردنەوەی بۆ هەموو خوینەریك بەخشراوە بۆ بلاو کردنەوەی لە پیناوی ( خوای گەورە ) بلاوی بکاتەوە ،هەروەك پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموویت: (( بلغوا عني ولو آية ))صحيح البخاري . یان پیغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم )دەفەرموویت: (( الدال على خير فاعليه )). ضعيف الجامع الالباني . واتە :ئەو کەسەی چاکەیەك بەکەسیك پیشان بدا وە ئەوە وایە کەخۆی ئە نجامی دابی.

وآخر دعوانا أن الحمد الله رب العالمين الذي أعاننا ويسر لما سبيل إتمام هذا العمل الذي نرجو أن يكون خالصا لوجهه جلا وعلا ..